زنجیرەی تەندروستی و ژیان

# ئایدز و
# نەخۆشییە درمەکان ( گواستراوەکان)

## تای مالتا، ئەنفلەوەنزای باڵندان، نەخۆشی سارس

دانانی/ لیژنەیەك لەپزیشكان





كۆرینی/ د. فەیسەل عارەب بلباس

پێداچوونەوە/ موحسین چینی

2013

زنجیرەی تەندروستی و ژیان

# ئایدز و
# نەخۆشییە درمەکان ( گواستراوەکان)

تای مالتا، ئەنفلەوەنزای باڵندان، نەخۆشی سارس

دانانی/ لیژنەیەک لەپزیشکان



کوردیی/ د. فەیسەڵ عارەب بلباس

پێداچوونەوە/ موحسین چینی

2013

زنجیرەی تەندروستی و ژیان

# ئایدز و نەخۆشیە درمەکان (گواستراوەکان)

## تای مالْتا، ئەنفلەوەنزای بالْندان، نەخۆشی سارس

دانانی

لیژنەیەك لە پزیشکان

گۆڕینی بۆ کوردی

د. فەیسەلْ عارەب بلْباس

پێداچوونەوەی

موحسین چینی

ناوی کتێب: ئایدز و نەخۆشیە درمەکان (گواستراوەکان)
دانانی: لیژنەیەك لە پزیشکان
وەرگێڕانی: د. فەیسەڵ عارەب بلّباس
دیزاین: کارزان سەعیدی ( مەریوان گرافیك)
ساڵی چاپ: ٢٠١٣
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپ: چاپخانەی شەهاب – هەولێر

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٥٨٨)ی ساڵی٢٠١٣ی دراوەتێ

## پێشەکی

"نەخۆشـــیە درمـــەکان یـــان گواســـتراوەکان" دەســـتەواژەیەکە بـــۆ ژمارەیـــەکی زۆر لەنەخۆشـیان بـەکار دەهێنـرێ کـە لـەژماردن نایـەن... لەوانـە ئـەو نەخۆشیانەی لەکۆنەوە باو بوون پاشان نەمان یان خەریکـە نـامێنن. ئەگـەر ژمارەیـەکی کـەم یـان زۆریـــشیان لێ مـــابێ ئـــەوا لەچـــەند ناوچـــەیەکی دیاریکراودا هەن.

هەیە نەخۆشیی تازە دۆزراوەن و بڵاوبوونەتەوە یان مەترســـیی بڵاوبوونـــەوەیان لێ دەکـــرێ. ئـــەو نەخۆشـیانە خـەڵك زۆریـان لـەبارەوە نـازانێ بۆیـە بەباشمان زانی بیانناسێنین.

وامان بەباش زانی باسی ئەو نەخۆشیانە بکەین کە زۆر بـاون و ناویـان لـە هەواڵـەکانی رۆژانـە لـەناو هۆیەکانی راگەیاندندا دووبارە دەبێتەوە، بەتایبەتی نەخۆشیی ئایدز.

ناسینی نەخۆشی ڕێگەیەکە بۆ خۆ لێ دوورخستنەوە و بەرگری کردنی و چارەکردنی لەکاتی گونجاودا نەک دوای ئەوەی دەستت لێ بستێنێ و چارە نەکرێ.

هەموو نەخۆشیەکانمان پێناسە کردووە و نیشانەکانیانمان روون کردۆتەوە لەگەڵ ڕێگەکانی خۆپاراستن و چارەکردنی بەگشتی.

ئەم زانیاریانە جێی پزیشك ناگرنەوە بەڵام یارمەتی نەخۆش دەدەن بۆ ئەوەی لە نەخۆشیەکەی بگا و هاوکاریی پزیشکیش بکا بۆ گەیشتن بە چارەسەریەکی خێرا.

## سەرەتا: درمیبوون چییە..؟

درمی یان درمیبوون (العدوی Infection):

بریتیە لەهێرشبردنی زیندەوەرە بچووکە بەزیانەکان بۆ ناو لەش. واتە ئەو زیندەوەرە وردبینیانەی کە بەچاو نابینرێن. ئەوانیش بەکتریا (بەخڕ و چوکلەیی و پێچاوپێچەکانیەوە) و مشەخۆر و ڤایرەس و کەڕووەکان دەگرێتەوە. ئاو و هەوا و خۆڵی دەوروپشتمان پڕن لەو بوونەوەرە وردانە، بەڵام زۆربەیان بێ زیانن و هەندێکیان بۆ بوونی ژیان لەسەر رووی زەوی بەسوود و بگرە پێویستیشن. کەمێکیان بەزیانن و دەبنە هۆی نەخۆشیان.

ناوەندەکانی درمیبوون: بەکتریا، کە بوونەوەرێکی وردبینیە لەشانشینی رووەکدا، بەرپرسە لە زۆر جۆرە نەخۆشی درم. لەسەر مادە ئۆرگانیەکان دەژی کە شانەکانی جەستەی مرۆڤیان لێ دروست بووە.

ئەو گەرمی و شێداریەی کە جەستەی مرۆڤ هەیەتی وادەکا ناوەندێکی نموونەیی ئامادەکراو بێ بۆ گەشەکردنی بەکتریا. هەموو ئەو بەکتریایانەی کە دەچنە ناو لەشەوە زیانبەخش نین، چونکە هەندێکی کە لەناو ریخەڵۆکەکاندا دەژین بۆ تەندروستی هەر پێویستیشن.

ئەو بەکتریایەی کە نەخۆشی پەیدا دەکا جۆرە مادەیەکی کیمیاوی دەردەدا کە ناوی (تۆکسین)ە. ئەو مادەیە ژەهرە و کە بەناو جەستەدا بڵاودەبێتەوە هەندێك لەفرمانە فیزیۆلۆجیە ئاساییەکان تێك دەدا. هەر ئەوەشە نیشانەکانی نەخۆشیەکە پەیدا دەکا.

بۆ نموونە: بەکتریای گەرووخڕە (خناق = دەفتیریا) کە هەندێك جار لەناو قوڕگ و گەرووی هەوکردوودا دەبێ، جۆرە تۆکسینەك دەردەدا کە دوور نیە ماسوولکەی دڵ تێك بدا.

زانایـان بڕوایـان وایـه كـه ڤایرەسـەكان مـادەی كیمیـاویی ناوەنـدن لـەنێوان مـادەی زینـدوو و نازینـدوودا كـه دەتـوانن هێرش بكەنـه سـەر خانـەی دیـاریكراو و تێیـدا زۆر بـن. ڤایرەسـەكان زۆر نەخۆشی پەیدا دەكەن كه درمیەكی توندیان هەیە و ئەو نەخۆشیە تادارانەی مندالأنی، وەك: سۆریكە و ئیفیلجی مندالأن و خوریكە و مێكوتە و ئەنفلەوەنزا و هەلأمەت... هەموویان بەهۆی ڤایرەسەوەن.

مشەخۆرە وردبینیەكانی كـه تووشـی مرۆڤ دێـن لـه خێزانـی "یـەك خانەییـەكان"ن و لـه نموونـه بەناوبانگەكانیان ئەمیبا و پلازمۆدیۆمی مەلاریا كـه نەخۆشیەكانی دیزانتریای ئەمیبی و مەلاریا تووش دەكـەن و زۆر نەخۆشـیی دیكـەش هـەن كـه مشەخۆرەكان پەیدای دەكەن.

كەڕووەكان چوارەمین و دوایین هۆكاری نەخۆشیە درمـەكانن كـه رووەكـی زۆر بـچووكن و نەخۆشـیی

پێست دروست دەکەن، وەك: کەچەڵی و سووتانەوەی کەلێنی پەنجەکان، بەتایبەتی پەنجەکانی پێ کە پێی دەگوترێ: (پێی وەرزشوانان).

ڕێگاکانی درمیبوون یان گواستنەوە: بوونەوەرە وردبینیەکانی کە نەخۆشی پەیدا دەکەن لەهەموو شوێنێکدا هەن، بۆیە ئەستەمە لەژیانی ڕۆژانەماندا لێیان دوورکەوینەوە، بەلاّم سەرەتا بەهەر ڕێگەیەك بێ دەبێ بچنە ناو جەستەوە پێش ئەوەی نەخۆشی دروست بکەن. پێستی ساغ و پەردە لینجەکان بەربەستی بەهێزن و نایەڵن ئەو میکرۆبانە لێیانەوە بچنە ژوورێ، بەلاّم بەزۆری کاتێك دەگوازرێنەوە کە شوێنێکی پەردە لینجەکەی ناو دەم و نووت و گوێ یان چاوەکان یان کۆم و ئەندامەکانی زاوزێ یان پێست خۆی... تووشی رووشانێك یان برین و

پـــچڕانێك دێ و لێیـــەوە ئـــەم زیندەوەرانـــە دەچـــنە ناوەوەی لەشەوە.

زۆربــەی نەخۆشــیە درمــەکانی کــە تووشــی منــداڵان دێـن بـەهۆی چـوونە ژوورەوەی ئـەو زیندەوەرانـەوە دەبــێ کـــە بـــە ڕێبـــازی هەناســـەداندا تێدەپـــەڕن. میکرۆبـــەکانی ســـۆریکە و دەفتیریـــا و کۆخەڕەشـــە لەناو ئەو پڕیشکانەی کە نەخۆشەکان لەدەمیانەوە بەکۆکـــە و پـــژمین دەریـــان دەدەن بـــەناو هـــەوادا بڵاودەبنەوە.

دەســتدانە جلوبــەرگی نــەخۆش یــان پێخەفەکــەی و نەشووشتنی دەستەکان دوای ئەوە، لەوانەیە ببێتە هۆی گواستنەوەی نەخۆشیەکە. پشتگوێ خستنی شووشـتنی دەسـتەکان دوای چـوونە سـەر پێـشاو هۆکارێکــە بــۆ تووشــبوون بەنەخۆشــیەکانی، وەك: ژەهراویبوون بەخواردن و دیزانتریا و گرانەتا (تـای تایفۆئیــد). مــێش و مێروولــە هاوشــێوەکانی کــە

لەسـەر خاپـەڕۆکان دەژیـن و دێنـە سـەر خواردەمەنیـەکان دەبنـە هۆکارێـك بـۆ گواسـتنەوەی نەخۆشیەکان لە ریخەڵۆکەکانەوە.

نەخۆشـیی دیکـە هەیـە کـە بـەڕێگای بەریەککـەوتنی نـەخۆش و کەسـی لەشـساغەوە دەگوازرێتـەوە. نەخۆشـیەکانی سـووزەنەك (سـیفیلس) و فـەڕەنگی بەتـەنیا لـە ڕێـی پەیوەنـدیی سێکـسیەوە دەگوازرێنـەوە چـونکە میکرۆبـەکانیان تـەنیا بـۆ ماوەیـەکی کـورت لـەدەرەوەی لـەش و لەهـەوادا دەژین.

ئـەو پێـشوولانەی کـە خـوێن دەمـژن، وەك: پێـشکە (مێـشوولە) و ئەسـپێ و کـێچ، هەنـدێك نەخۆشـی لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگوازنـەوە. پێـشوولە هەیە مەلاریا و زەردەتا و هەندێك جۆر لەهەوکردنی مێشك هەڵدەگرن و ئەسپێ میکرۆبی تایفۆس و کێچ

نەخۆشـیی تـاعوونی گرێـدار (دومـەڵی) لەمـشکەوە دەگوازنەوە.
هەندێك ئاژەڵیش نەخۆشـی بـۆ مرۆڤـان دەگوازنـەوە. ئـەوەتا مـەڕ نەخۆشـیی پەنگرەپیـسە (ئـەنتراکس) دەگوازێتەوە و سەگیش دەردەهاری.
پێویـستە دوای چوونە ژوورەوەی میکرۆبـان بۆ نـاو لـەش ڕەوشـی گونجـاو بڕەخـسێ تـا نەخۆشـیەکە پەیدابێ. دەبـێ میکرۆبەکە بەژمارەیـەکی دیـاریکراو بـن و هێزیـان ئەوەنـدە هـەبێ کـە بتـوانن شـانەکان لەناو ببەن. هەروەها دەبێ ئەو جەستەیەی هێرشـی کراوەتــە ســەر ئامــادەگی تێــدابێ بــۆ گرتنــەوەی نەخۆشـیەکە، چـونکە ئەگــەر لــەدژی نەخۆشـیەك بـەرگریی پەیـدا کردبـێ یـان کـوترابێ ئـەوا ئـەو میکرۆبانـە کـاری تێناکـەن. هەنـدێك کەسیش هەیـە بەرگریەکی سرووشتیان لەجەستەدایە بۆ میکرۆبان.
پاشـان دەبـێ نەخۆشـیەکە بـە ڕێگـەی راسـت و

دروستەوە چووبێتە ناو لەشەوە. دەبێ میکرۆبی مەلاریا بچێتە ناو خوێن و میکرۆبی دیزانتریا بچێتە ناو ریخەڵۆکەکان و میکرۆبی سیفلسیش لە رێگەی ئەندامەکانی زاوزێوە...

چۆن لەش بەرەنگاری میکرۆبان دەبێتەوە؟

میکرۆبەکان کە دەچنە ناو جەستەوە دەست بەزۆربوون دەکەن. یەکەم کاردانەوەی جەستەش بۆ ئەمە هێرشکردنی ژمارەیەکی زۆر لەخانە سپییەکانی خوێنە بۆ شوێنی میکرۆبەکان بۆ ئەوەی بیانخۆن و لەناویان ببەن. هەروەها مووخی ناو ئێسکەکان چوست و چالاك دەبن بۆ ئەوەی زۆرترین ژمارە لەو خانانە بەرهەم بێنن بۆ بەرەنگاربوونەوەی میکرۆبان. لەهەمان کاتدا موولوولەکانی خوێن و خوێنبەرەکانی ئەو شوێنە فراوان دەبن بۆ ئەوەی خوێنیان زۆرتر بۆ بچێ. دژەتەنەکانیش Antibody، کە مادەی کیمیاوین و دەتوانن بەکتریا بکوژن و تۆکسینەکانی لەکار بخەن، لەلای خۆیانەوە

دەکەونە کار. هەروەها شلەکانی لەشیش لەوێ کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی یارمەتیی مادە کیمیاویەکان بدەن بۆ لەناوبردنی میکرۆبەکان. لەزانستی نەخۆشیناسیدا (پاتۆلۆجی) بەم دیاردەیە هەمووی دەگوترێ (سووتانەوە یان هەوکردن یان تەشەنەکردن).

ئەگەر ئەوانە سەرکەوتن ئەوا میکرۆبەکە لەناو دەچێ، ئەگەرنا ئەوا نەخۆش پێویستیی بە یارمەتیی پزیشکی دەبێ. لەوانەیە نیشانەکان نەمێنن بەلآم میکرۆبەکان هەر بمێننەوە. بەم شێوەیە کەسەکە دەبێتە هەڵگری میکرۆبان و نەخۆشیەکە دەگوازێتەوە بێ ئەوەی خۆی تووشی هاتبێ.

بەرگریکردن لەنەخۆشیە درمەکان: مرۆڤ تووشی نەخۆشیەکانی مندالآنی، وەك: سووتانەوەکانی رێبازی هەناسەدانی لەجۆری ئەنفلەوەنزا و هەلآمەت دەبێ بەلآم تووشی نەخۆشیە درمەکانی

دیکە نابێ، چونکە جەستە وردە وردە بەرگریەك بۆ ئەو نەخۆشیانە هەر لەمنداڵیەوە پەیدا دەکا.
دوو جۆرە بەرگری هەیە: سرووشتی و دەستکرد.
بەرگریی سرووشتی لەدوای تووشبوون بە نەخۆشیەکەوە پەیدا دەبێ. بۆ نموونە: سۆریکە و گوێڕەپە و خوریکە بەدەگمەن لەجارێك پتر تووشی کەسێك دێن. بەڵام ئەو بەرگریە سرووشتیە بۆ هەموو نەخۆشیەك جێی متمانە نیە چونکە ئەوە بەدروستبوونی دژەتەن بۆ نەخۆشیەکە پەیدا دەبێ. تووشبوونە سووك و دووبارەبووەکان بەرگری دەبەخشنە لەش و ئەو بەرگریەش لە تووشبوونی مەترسیداری دەپارێزێ. لەو نەخۆشیە درمانەی کە نابنە هۆی دروستبوونی بەرگریی سرووشتی: پەسیو و هەڵامەتەکانە لەگەڵ سیفلس و مەلاریا.
بەرگریی دەستکردیش دوو جۆرە: چالاك (ئەکتیڤ) و سست یان ناچالاك (پاسیڤ). ئەوانە لە ڕێگەی کوتان و دەرزی لێدانەوە دەست دەکەون. بەرگریی چالاك بەوە دەستدەکەوێ کە میکرۆبی مردوو یان

بێهێزکـراوی نەخۆشـیەك بدرێتـە کەسـێك، وەك: کوتـان لـەدژی خوریکـە کـە تێیـدا دژەتـەن بـۆ ئـەو میکرۆبانە دروست دەبیٚ کە زۆر بەمیکرۆبی ئاسایی و زینـدووی خوریکـە دەچـن و لـە رێـی دەرزیـەوە دەکرێنـە نـاو لەشـەوە. ئـەو دژەتەنانـەش جەسـتە لەتووشـبوون بـەم نەخۆشـیە دەپـارێزن. بـەرگریی چالاك بۆ چەندان مانگ و سالاٚن بەردەوام دەبیٚ و هەر دەمێنێتەوە.

هەرچی بەرگریە ناچالاٚکەکەیە ئەوا لە رێی تێکردنی دژەتـەنی پێشتر ئامادەکراو بۆ نـاو لەشـەوە پەیدا دەبـیٚ. ئـەو دژەتەنـە ئامادەکراوانـەش لـەمرۆڤ یـان گیانداری تووشبوو بەنەخۆشیەکە وەردەگیرێن. ئـەم بەرگریـە کاتیـە و تـەنیا لـەکاتی بلاٚوبوونـەوەی پەتایاندا بـەکاردەهێنریٚ یان ئـەو کاتـەی کـە یـەکێك لەنەخۆشیەکی ترسناك نزیك دەبێتەوە.

## ١- ئایدز (سیدا)

### ئایدز چییە؟

- ڤایرەسێکە هێرش دەکاتە سەر ئەو سیستەمەی بەرگری لەش کە بەرپرسە لە پاراستنی جەستە لەمیکرۆبە جیاوازەکان و هەندێك جۆری شێرپەنجەش. ئەم میکرۆبە وا لەمرۆڤەکە دەکا کە توانای بەرگریکردن لەناو جەستەیدا بۆ میکرۆب و شێرپەنجان نەمێنێ.
- بەم ڤایرەسە دەگوترێ " ڤایرەسی نەهێشتنی بەرگری لەمرۆڤ " Human Immune Deficiency Virus یان بەکورتییەکەی HIV.
- ناوە زانستییەکەی نەخۆشی ئایدزیش ئەوەیە "کۆنیشانەی نەمانی بەرگریی دەستکەوت" یان "کۆنیشانەی کەمبوونەوەی بەرگریی دەستکەوت" Acquired Immune Deficiency Syndrome یان بەکورتییەکەی AIDS. (لەزمانی

فەڕەنساویدا وشەکان پاشوپێش دەکرێن بۆیە ناوەکەی دەبێتە سیدا Syndrome du Immune Acquise Deficiency یان بەکورتی SIDA. وەرگێڕ).

- تا ئێستا چارەسەریەکی بنبڕ بۆ ئەو نەخۆشیە نیە بۆیە کە تووش بوو لەگەڵ ژیانیدا دەمێنێتەوە.

نیشانەکانی ئەو نەخۆشیە:

- نەخۆش بەقۆناغێکدا تێدەپەڕێ کە نیشانەکانی لێ دەرناکەون. ئەو ماوەیەش دەکەوێتە نێوان رۆژی تووشبوون بەمیکرۆبەکە و ئەو رۆژەی کە نیشانەکانی بە ئاشکرا دەردەکەون. ئەم ماوەیە بەوردی نەزانراوە و دەکەوێتە نێوان شەش مانگ و چەند ساڵێك. لەمنداڵاندا بەتێکڕا ساڵێك و لەگەورانیشدا پێنج ساڵ دەخایەنێ.

- دوای سێ چوار حەفتە لەچوونە ژوورەوەی ڤایرەسەکە بۆ ناو جەستە، نزیکەی ٥٠ – ٧٠٪ تووشبووان جۆرە ئێش و بێهێزی و ئازاری ناو گەروو و تێکچوونی گرێیە لیمفاویەکان و ژانی ماسولکە و سەرئێشەیان لێ پەیدا دەبێ و پەڵە لەسەر پێستیان دەردەکەوێ.
- ئەم نیشانانە بۆ ماوەی دوو یان سێ حەفتان بەردەوام دەبن دوایی بزر دەبن و نەخۆش دەچێتە قۆناغی شاردراوە (متبوون یان کرپبوون)ی نەخۆشیەکە.
- قۆناغی خۆشاردنەوەی نەخۆشیەکە بۆ چەند مانگ و ساڵان بەردەوام دەبێ کە تێیدا ڤایرەسەکە زۆر دەبێ و زۆرترین بڕی خانەکانی سیستەمی بەرگریی لەش تووش دەکا.
- لەقۆناغی دوای ئەوە نیشانەکان لەسەر شێوەی ئاوسانێکی بەربلاو و بەردەوامی گرێیە

لیمفاویەکان دەردەکەون و بەلای کەم بۆ سێ مانگان درێژە دەکێشن، بەبێ ئەوەی هۆکارێکی دیاری بۆ بدۆزرێتەوە.

- ئەوجا بارەکە پەرە دەسێنێ و ئەوانە پەیدا دەبن:

١- کێش دابەزین.

٢- شلوخاوی و ماندووبوون.

٣- حەز نەچوونە خواردن.

٤- زگچوون.

٥- تا.

٦- عارەقەکردنی شەوانە.

٧- ژانەسەر.

٨- خورشت.

٩- وەستانی بێنوێژی مانگانە (لەژنان).

١٠- ئەستووربوونی سپڵ (فاتەڕەشە).

قۆنـــاغی ئایـــدز: بـــەخراپترین قۆناغـــەکانی تووشبوون دادەنریّ و ئەو نیشانانەی سەرەوە وردە وردە دەردەکەون بەلاّم بەشێوەیەکی زۆر ئاشکراتر، لەگـەلّ پەیـدابوونی نەخۆشـیی هەلپەرسـت (هەلەکـە دەقۆزنـەوە) و گرێـی پـیس (شـێرپەنجەیی). هـەموو ئەمانـە لەئـەنجامی کەمبوونـەوەی بـەرگیی لەشـەوە پەیدا دەبن.

دوای پێنج سالّ لەتووشبوون نیشانەکان لـە ٢٥٪ نەخۆشەکان دەردەکـەون و لـە ٥٠٪ شـیاندا دوای دە سـالّ. هەنـدێك نـەخۆش هـەر نیـشانەیان لیّ دەرناکەویّ.

هەنـدێك لـەو هۆکارانـەی کـە یارمـەتیی خێـرا دەرکەوتنی نیشانەکان دەدەن، وەك:

- دووبارە تووشبوونەوە بە میکرۆبەکە.
- دووگیان بوون.

- تووشبوون بەو نەخۆشیانەی کە بەرگری بێهێز دەکەن.

ئایا دەکرێ هەر بەروخساری دەرەوەی نەخۆشی ئایدز بناسرێتەوە؟

ناکرێ نەخۆشی ئایدزدار تەنیا بەشێوەی دەرەوەی بناسرێتەوە. شیکاریە تاقیگەییەکان (پشکنین بۆ ئایدن) و هەندێك نیشانەی کە لەگەڵیدا دەردەکەون نەخۆشیەکە دەسەلمێنن. بێجگە لەمانە نەخۆش وادەردەکەوێ کە لەوپەڕی تەندروستی دایە.

ئایدز چۆن دەگوازرێتەوە؟

خۆشبەختانە لەهەموو رێگاکانی گواستنەوەی ئەم دەردە خۆپاراستن هەیە. ڤایرەسی ئەم نەخۆشیە بەیەکێك لەم رێگایانەی خوارەوە دەگوازرێتەوە:

١- ڕێگای سەرەکیی گواستنەوەی ئەم نەخۆشیە پەیوەنـدیی سێکـسیە - بـەجۆری سرووشـتی و ناسرووشتیـشیەوە - لەگـەڵ کەسـێکی نـەخۆش. بـوونی نەخۆشـیی دیکـەی سێکـسی ئەگـەری تووشبوون بەم دەردە پتر دەکا.

٢- هـەروەها میکرۆبەکـە لـەڕێی گواسـتنەوەی خـوێن و شـلەکانی دیکەیـەوە کـە ئـەم ڤایرەسـەیان تێدابێ دەگوازرێتەوە.

٣- گواسـتنەوەی ئەندامـەکانی لـەش (گورچیلە، جەرگ، دڵ) لە بەخشەرێکی تووشبووەوە.

٤- بەکارهێنانی دەرزی یان ئامرازی دەمتیژ یان کونکەری پێست کە ئـەم ڤایرەسـەیان پێوەبێ، وەك: مووسی ریش تاشین و ئامرازەکانی کوتانی پێـست و گوێ کونکردن.

٥- له دایكه‌وه بۆ كۆرپه‌كه‌ی له‌كاتی دووگیانیدا یان بۆ منداڵه‌كه‌ی له‌كاتی له‌دایكبوونیدا یان له ڕێی شیردانی سرووشتیه‌وه له‌مه‌مكه‌كانی.

به‌ڵام ده‌ركه‌وتووه كه ڤایره‌سی ئایدز له ڕێی كاره كۆمه‌ڵایه‌تیه ناسێكسیه‌كانه‌وه ناگوازرێته‌وه. هه‌روه‌ها له‌ڕێی هه‌وا و ئاو و مێشووله و به‌ریه‌ككه‌وتنیش له‌یه‌كێكه بۆ یه‌كێكی دیكه ناچێ. نه‌زانراوه هیچ جاریش نه‌خۆشی ئایدز به‌هۆی به‌كارهێنانی كه‌لوپه‌لی نان‌دین یان به‌شداریكردن له‌ژووری خوێندن و ناو گه‌رماو گوازرابێته‌وه بۆ یه‌كێك.

هه‌ندێك له‌و توێژینه‌وانه‌ی كه له ئه‌نستیتیۆی (پاستۆر) كراون ئاماژه بۆ ئه‌وه ده‌كه‌ن كه ئه‌م ڤایره‌سه پیسه له‌وانه‌یه زۆر له‌وه توندوتیژتر بێ كه پێشتر به‌خه‌ڵك گوتراوه. چونكه زۆرجاران دامه‌زراوه ته‌ندروستیه‌كان ئه‌وه‌یان ڕاگه‌یاندووه كه ڤایره‌سی

ئایدز ناتوانێ لەدەرەوەی لەشی تووشبووەکەدا بمێنێتەوە، کەچی توێژەرانی ئەنستیتیۆی پاستۆر بە روون و ئاشکرا دەریان خستووە کە ڤایرەسی ئایدز دەتوانێ لەدەرەوەی جەستەشدا بمێنێتەوە، بگرە دەتوانێ بۆ ماوەی (١١) رۆژانیش لەناو ئاوی پاکنەکراوەدا بژیێ. بەمە دەردەکەوێ کە ڤایرەسی ئایدز بەو ناسکیە نیە کە پێشتر زۆرکەس وایان دەزانی. لەگەڵ بوونی ئەم تێڕوانینە جیاوازانەدا ئێمە باوەڕمان وایە ئەم ڤایرەسە بەترسە دەتوانێ بۆ چەند رۆژێك لەدەرەوەی جەستە و لەناوەندێکی وشکدا بەناچالاکی بژیێ، پاشان چوست دەبێ و دەبێتە درمێکی زۆر دڕ (شرس) لەناو لەشدا.

تووشبوون بەنەخۆشی ئایدز مەرج نیە نیشانەی رەفتاری لەڕێ لادان بێ و هیچ ترسی تێکەڵبوونێکی ئاسایی لەگەڵ نەخۆشەکەدا نیە، چ لەناو خێزان بێ یان لەشوێنی کارکردن و قوتابخانە و یانەکان،

ئەگەر رەچاوی هەندێك ڕێوشوێنی پاكوخاوێنی بكرێ. نەك هەر ئەمە بەڵكو پێویستیشە تێكەولێكە وەكو كەسێكی سرووشتی لەگەڵ نەخۆشەكەدا بكرێ و رەچاوی ئەو رەوشە دەروونی و كۆمەڵایەتیەی بكرێ كە پێیدا تێدەپەڕێ.

پشكنین بۆ ئایدز چیە؟

پشكنینێكە هەموو كەسێك دەتوانێ لەهەر دەزگایەكی تەندروستی بۆخۆی بیكا (لەڕاستیدا لەلای خۆمان تەنیا لەتاقیگە ناوەندیەكاندا ئەنجام دەدرێ. و.). ئەم پشكنینە پشت بەبوونی ئەو دژەتەنانە دەبەستێ كە بۆ ڤایرەسەكە لەناو خوێندا پەیدا دەبن. ئەنجامی پشكنینەكە لەدوای تووشبوون بەمیكرۆبەكە بەنزیكەی ٦ – ١٢ حەفتە پۆزەتیڤ دەبێ. لەكاتی پۆزەتیڤبوونی ئەم پشكنینەدا پشكنینێكی دیكەی دڵنیاكەر دەكرێ كە

پێی دەگوترێ (وێسترن بلۆت Western Blot) و لەمەوە بەتەواوی تووشبوونەکە دەسەلمێنرێ.

چارەسەری: هەرچەندە هەوڵدانێکی زۆر هەیە بۆ چارەکردنی نەخۆشیی ئایدز بەلاّم تا ئێستاش چارەسەریەکی سەرکەوتوو بۆ ئەم دەردە نیە. زۆر لە توێژەران لەو دەرمانانەیان کۆڵیوەتەوە کە دەتوانن گەشەکردنی ڤایرەسەکە لەکاتی چاندنی لەناو تاقیگەدا رابگرن. دەرمانی (زودۆڤیودین Zudovudine Retrovir) کە بەزۆری پێی دەگوترێ AZT و دەرمانی (زالسیتابین HiviD) کە ناودەبرێ ddc و (ستافۆدین Zerit) کە بە d4T دەناسرێ و (دیانۆسین vidrx) کە بە ddI دەناسرێ و (لامیگۆدین Epivir) کە پێی دەگوترێ C3... هەموو ئەو دەرمانانە هاوتا و لێکچووی Nucleoside ن. دەرمانی AZT یەکەم دەرمان بوو کە بەفەرمی بڕیار لەسەر بەکارهێنانی درا بۆ

ڤایرەسی ئایدز HIV و یەکەم دەرمانیش بوو کە بۆ چارەکردنی تووشبوون بە ڤایرەسی ئایدز بەکارهات. هەر ئەو دەرمانە کاریگەرییەکی زۆری نیشاندا لە نەهێشتنی گواستنەوەی ڤایرەسەکە لە دایکەوە بۆ کۆرپەڵەکەی ناو زگی لەکاتی دووگیانیدا. هەرچی لێکچووەکانی دیکەی (نەکلیوسایدە)ە ئەوا لە بنەڕەتدا وەکو باجوای (بدیل) دەرمانی AZT تەماشا دەکران، بەڵام دوایی دەرکەوت کە لەزۆر باراندا لەگەڵ AZT زۆر باش کاردەکەن. وادیارە ئەو دەرمانانە بۆ ماوەیەکی درێژتر نەخۆشەکە دێڵنەوە و پەرەسەندنی تووشبوون بە ڤایرەسەکە لەقۆناغی بێ نیشانەوە بۆ قۆناغی نەخۆشیی ئایدز بەهەموو توانا و دژواریەوە دوا دەخەن (بەلای کەم لەلای هەندێك کەس). دەکرێ هەر یەکەیان بەتەنیا یان پێکەوە بەکار

بهێنرێن. بۆ نموونە دەرمانی AZT دەکرێ لەگەڵ یەکێك یان پتر لەدەرمانەکانی دیکە بەکاربهێنرێ.

بەڵام ئەو دەرمانانە کاری لابەلایی ژەهراویشیان هەیە وەك: زگچوون و کەمخوێنی، بۆیە پێویستە نەخۆش خوێنی بدرێتێ. سەرباری ئەمە دەرمانی AZT نرخەکەی گرانە و بەزەحمەتیش دروست دەکرێ، بۆیە زۆر دەرمانی دیکە هەن کە کاریگەریان زۆرتر و مەترسیان کەمترە و ئێستا پەرەیان پێدەدرێ. لێکۆڵینەوەی دیکە هەیە نیشانی دەدا کە سووتانەوەی توورەگەداری سیپەلاکەکان دەکرێ بە بەکارهێنانی دژەژیانەکانیش (ئەنتی بایۆتیك) چارە بکرێ بێجگە لە دەرمانی (پێنتامیدین). ئەو دەرمانە بەکارەی کە ناوی (ئینتەرفیرۆن)ە، ئەویش لەچارەکردنی ئایدزدا بەکار دەهێنرێ. (ئینتەرفیرۆن مادەیەکی کیمیاویە خانەکانی مرۆڤ و گیانەوەرە مەمکدارەکانی دیکە وەکو کاردانەوە بۆ تووشبوون

بەڤایرەس یان بەهۆی مادەی کیمیاویی دیکەوە دروستی دەکەن. سیێ جۆرە ئینتەرفرۆن هەیە کە نایەڵن تووشبوون بەڤایرەسی ئایدز بڵاوبێتەوە و گەشەکردنی خانەی شێرپەنجەداریش رادەگرن).
سەرباری ئەوانەی رابردن هێشتا زانایان هەوڵ دەدەن دەرمانی دیکە بدۆزنەوە کە یارمەتیی سیستەمی بەرگریی لەش بدەن بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

چارەکردنی نەخۆشی ئایدز بە دوو رێگایە:

یەکەم: هێرشکردنە سەر خودی ڤایرەسەکە و لەناوبردنی. دووەم رێگەش: ئەوەیە کە سیستەمی بەرگریی جەستەی نەخۆش چالاك بکرێ. لەبەر ئەوەی ڤایرەسی ئایدز هێرش دەکاتە سەر خانەسپییەکانی خوێنی کە بە خانەکانی (تی T cell) ناسراون و لەناو ئەو خانانەشدا ڤایرەسەکە ئەنزیمێك دەردەدا کە بەناوی (ترانسکریپتەیز)

ناسراوە و خانەی (تی) لە کارە بەرگریکردنەکەی خۆیەوە دەگۆڕێ بۆ بەرهەمهێنانی ڤایرەس، بۆیە ڕاگرتنی نەخۆشیەکە دەوەستێتە سەر ڕێگەیەکی چوست بۆ ڕاگرتنی کاری ئەم ئەنزیمە، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی خانەی تازە لەخانەکانی (تی) تووشی ڤایرەسەکە نەبن.

توێژینەوە زانستیەکان لەهەموو وڵاتانی جیهان چالاك بووینە و لە گەیشتن بەم ئامانجەش نیمچە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە کە ئەویش دروستکردنی دەرمانێکە بۆ ڕاگرتنی کاری ئەم ئەنزیمە، بەڵام هەندێك ناتەواوی هەیە، لەوانە ژەهراویکردنی جەستەی نەخۆش. لیکۆڵینەوەکانیش بۆ باشترکردن و پەرەپێدان و بەرهەمهێنانی دەرمانی بەکار و هەمەجۆر هەر بەردەوام دەبن بۆ ئەوەی ڤایرەسی ئایدز لەناوبرێ

و سیستەمی بەرگریی نەخۆش چوست و چالاك بكرێ.

لەم رووەوە وا باشە بڵێین هەندێك لە زانایان توێژینەوە لەسەر كۆمەڵە دەرمانێكی دژە ڤایرەسان ئەنجام دەدەن. ئەو دەرمانانەش بەشێوازێكی جیاواز لەدەرمانەكانی دیكەی دژەئایدز كار دەكەن. دەرمانی ئێستا گەشەكردنی ڤایرەسەكە رادەگرێ كاتێك كە دەچێتە ناو جەستەوە بەڵام دەرمانە نوێیەكان لێناگەڕێن ڤایرەسەكە بچێتە ناو خانە ساغەكانی جەستەوە.

ئایا كوتان بۆ ڤایرەسی ئایدز هەیە؟

تا ئەم كاتەش كوتانێكی چالاك بۆ ڤایرەسی ئایدز نەدۆزراوەتەوە. لەگرنگترین ئاستەنگەكانی پێش ئەم ئامانجە ئەوەیە كە ڤایرەسەكە بەبەردەوامی پێكهاتەكەی خۆی دەگۆڕێ كە ئەمەش وا دەكا بەرهەم هێنانی كوتانێك لەدژی ئەم میكرۆبە كارێكی زۆر زەحمەت بێ.

## ٢- گرنگترین نەخۆشیە درمەکان

### ٢-١ هەڵامەت، پەسیو Common cold:

هەڵامەت لەهەموو نەخۆشیە درمەکان بڵاوترە کە بریتیە لەتووشبوونی ڕێبازەکانی سەردوەی هەناسەدان بە ڤایرەس و جۆرە تیژەکەی بە بەریەککەوتن دەگوازرێتەوە. چەند جۆرە ڤایرەسێك هەن کە ژمارەیان لە بیست کەمتر نیە، دەبنە هۆی ئەم دەردە. لەوانەیە تووشی کەسێك بن کە لەبەهەر هۆیەك بێ، بەرگریی لەشی کەمبووبێتەوە. ئەم ڤایرەسانەی هەڵامەت، جێی داخە، کە دژەژیانەکانی ئێستا کاریان تێناکەن و هێشتاش کوتانێکی ئەوتۆیان بۆ نەدۆزراوەتەوە کە کاریگەریەکی توندی هەبێ و لەهەموو بارێکدا بەرگری لەدژیان لەناو جەستە پەیدا بکا. بۆیە تووشبوون بە هەڵامەت تەنیا بۆ ماوەیەکی زۆر کورت بەرگری لەناو جەستە

دروست دەکا، لەبەر ئەوە زۆر لەخەڵکان سالانە چەندان جار تووشی ئەو پەسیو و هەڵامەتانە دێن.

### ٢-٢. سووتانەوەی سیپەلاك Pneumonia

بریتیە لەهەوکردنێك یان تووشبوونێکی تیژ بەمیکرۆبان. پێشان بەگرنگترین هۆکاری مردن دادەنرا و لەهەر چوار کەساندا یەکێك پێی دەمرد. ئێستاش لەناو منداڵ و بەساڵاچوواندا بەتایبەتی، مەترسیی زۆرە چونکە بەرگەی تووشبوونی ناگرن. لەگەڵ ئەمەشدا بە رێژەیەکی زۆر مردن بەو دەردە کەمبۆتەوە پاش ئەوەی دەرمان و چارەسەریی تازە پەیدا بوون.

جۆر و نیشانە و چارەکردنەکانی: سووتانەوە میکرۆبیەکانی سیەکان بەهۆی بەکتریا یان بەهۆی ڤایرەسەوە دەبن. لەهەمانەکاتیشدا یان سەرەتایین یان دووەمی (واتە سەرباری نەخۆشیەکی دیکە پەیدا دەبن). هەردوو سیپەلاکەکان یان تەنیا

یەکێکیان تووشی دێن. لەگرنگترین هۆکارەکانی بەکتریایەکە کە ناسراوە بە خڕەسیپەلاکیەکان Pneumococcus. ئەم بەکتریایە هەمیشە لەناو دەم و قوڕگدا هەن، بەلاَم زیانیان نیە تەنیا ئەگەر بەرگری جەستە زۆر کەمبۆوە، ئەویش لەبەر سەرمای توند یان نەخۆشیەك یان ژەهراویبوون بە ئەلکهوول یان بێهێزیەکی گشتیی لەش.

تەمەنیش هۆکارێکە بۆ بلاَوبوونەوەی. ئەگەر بەرگری لەشی نەخۆشەکە کەمبۆوە یان بەکتریایەکە زۆر بەهێز بوو، ئەوا بەناو هەردوو سیپەلاکەکاندا بلاَودەبێتەوە و دەبێتە هۆی سووتانەوەی سیەکان.

دەرمانە دژەزیندەگی و سولفۆنامایدەکانیش هۆکاربوون بۆ کەمکردنەوەی مەترسیی ئەم دەردە. لەوانەیە لەهەندێك باراندا بەتەواوی چاکی بکەنەوە. پێویستە نەخۆشە لەسەر وەرگرتنی ئەم دەرمانانە

بۆ ماوەی یەك حەفتە دوای چاكبوونەوەی بەردەوام بێ نەوەكو بگەڕێتەوە.

### ٣-٢. گوێڕەپە Mumps

نەخۆشیەكی ڤایرەسیی درمە تووشی یەكێك یان هەردووك گلاندی لیكاوی بناگوێ دێ. ئەم دوو گلاندە گەورترین گلاندی دەردانی لیكاون بۆ ناو دەم و دەكەونە پێش و ژێرەوەی گوێیەكان. هەندێك جار ئەو نەخۆشیە تووشی گلاندەكانی دیكەش دێ، وەك: گلاندەكانی ژێر زمان و كاژێر (كاكیلە). نەخۆشیی گوێڕەپە لەناو مندالانی پێنج تا پازدەسالی زۆرە چونكە لە قوتابخانەكان دەیگرنەوە بەلام گەنجانیش هەندێك جار تووشی دەبن.

نەخۆشیەكە بە پرپیشكی دەم و لووت لەنەخۆشێكەوە دەگوازرێتەوە بۆ یەكێكی ساغ. نەخۆش پێش ئەوەی نیشانەكانی ئەم دەردەی لێ دەركەوێ و دوای چاكبوونەوەشی بە یەكدوو رۆژان

میکرۆبەکە بۆ خەڵکی دیکە دەگوازێتەوە. ماوەی دەرکەوتنی نیشانەکانی لەنێوان یازدە بۆ بیست و هەشت ڕۆژە، بەلاّم بەزۆری دوای (١٨) ڕۆژان دەردەکەوێ. یەك جار تووشبوون بەم نەخۆشیە بەرگریەکی تەواو دەبەخشێ بۆیە دەگمەنە یەکێك دووجاران تووشی گوێڕەپە بێ.

نیشانەکان: یەکەمین نیشانەی نەخۆشیەکە ئاوسانی یەکێك لەگلاندەکانی بناگوێیە کە ئازاریشی لەگەڵ دەبێ. هەندێك جاریش نەخۆشیەکە بەبێ ئەستووربوون و تا هاتن تێدەپەڕێ و هەستیشی پێناکرێ.

ماکەکانی یان کارە لابەلاییەکانی: هەندێك جار نەخۆشیەکە تووشی گلاندەکانی زاوزێ دەبێ و لە نێرینەدا هێلکەگونەکان هەودەکەن. لەوانەیە هێلکە گونەکان پێش گلاندەکانی لیکاویش ئەستووربن. تووشبوونی هەردوو هێلکەدان لە مێیینەدا دەگمەنە

و دەستنیشانکردنیشی ئاسان نیە. لەنیشانەکانی ئێشی بنزگ و ئاوسانی هێلکەدانەکانە. دوور نیە مەمکەکانیش تووشی ئەم سووتانەوەیە بین.

لەوانەیە میکرۆبی گوێرەپە کار لە کۆئەندامی دەماریش بکا و ببێتە هۆی سووتانەوەی پەردەکانی مێشك.

چارەسەری: لەبەر ئەوەی زۆرن ئەو نەخۆشیانەی تووشی گلاندەکانی لیکاو دێن و چارەکردنیشیان جیاوازە، بۆیە باشترە سەردانی پزیشك بکرێ. بەدەگمەن ئەو منداڵەی تووشی گوێرەپە بووە پێویست بەخەواندنی ناو نەخۆشخانە دەکا مەگەر تایەکەی زۆر بەرز بێ. تەنیا مانەوەی لەماڵەوە و دوورکەوتنەوەی لە هاوڕێکانی بەسە. دوای ئەو ماوەیە دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ سەر خوێندن. لەکاتی نەخۆشیەکەدا باشترە خواردنە تەڕ و شلەمەنیەکان زۆرتر بخواتەوە.

## ٢-٤. ئەنفلەوەنزا Flu, Gripp, Influenza

نەخۆشـــیەکی درمـــی تیـــژە تووشـــی یـــەکێك لەبەشەکانی رێبازی هەناسەدان دێ هـەر لـە دەمـەوە تـا دەگاتـە سـیپەلاکەکان. ئێـستاش ئەنفلـەوەنزا نەخۆشیەکی مەترسیدارە بەتایبـەتی لـەناو منـداڵ و بەساڵاچـووواندا چـونکە بـەرگری کەمدەکاتـەوە و رێ بـۆ نەخۆشـیەکانی دیکـەی کۆئەنـدامی هەناسـەدان خۆش دەکا، وەك: سـووتانەوەی لوولـەکانی هەناسـە و بلۆقکردنیـــان و ســـووتانەوەی ســـیپەلاکەکان. هەنـــدێك جـــار گیرفانـــەکانی لـــووت و گـــوێی ناوەڕاستیش لەئەنجامی تووشـبوون بـە ئەنفلـەوەنزا تووشـــی ســـووتانەوە دێـن. لەوانەیـە دڵـیش کـاری تێبکرێ.

هۆکـار: هۆکـاری ئەنفلـەوەنزا لەهـەموو بارێکـدا ڤایرەسە و میکرۆبەکـەش بەخێرایی لەیەکێکـەوە بۆ

یەکێکی دیکە لە ڕێی کۆکە و پشمینەوە دەگوازرێتەوە.

نیشانەکان: بەزۆری ئەنفلەوەنزا کتوپڕ دوای ماوەیەکی کەم لەتووشبوون بەڤایرەسەکە دەردەکەوێ. کە میکرۆبەکە لە ڕێی کۆئەندامی هەناسەوە دەچێتە ژووری ئەوا هەر لەوێ نامێنێتەوە بەڵکو بەخێرایی بەناو هەموو جەستەدا بڵاودەبێتەوە. نیشانەکانیشی تا و کۆخە و هێڵنجهاتن و پشتئێشە و ژانی ماسولکەکانە لەهەموو شوێنێکی لەش. تایەکە لە ڕۆژێکەوە بۆ حەفت ڕۆژان دەمێنێتەوە پاشان کتوپڕ نامێنێ، بەلام نەخۆش دوای ئەوە وەکو یەکێکی بۆ ماوەیەکی درێژ نەخۆش کەوتبێ هەر هەست بە ماندوویێتی و بێهێزی دەکا.

چارەسەری: تا ئێستا چارەسەریەکی بنبڕ بۆ ئەنفلەوەنزا نیە چونکە ڤایرەسەکان بەدەرمانەکانی

وەك: سولفا و پەنسیلین لەناو ناچن، بەڵام هەندێك جار بۆ پاراستنی نەخۆشەكە لەتووشبوون بەبەكتریای دیكەی سەربار، ئەو دەرمانانەی دەدرێتێ. ئەنفلەوەنزا ماوەكەی خۆی هەر رادەكێشێ و پێویستە نەخۆش لەناو جێگەدا بمێنێتەوە، نەك هەر لەبەر سوودەكانی بۆ چاكبوونەوە بەڵكو بۆ ئەوەش كە خەڵكانی دیكە تووشی ئەو نەخۆشیە درمە نەكا.

گەرمی و خواردنەوەی زۆری شلەكان پێویستن. بەكارهێنانی دەرمانی وەك: ئەسپرین هەر چەند كاتژمێرەی جارێك باشە، بۆ ئەوەی تا و ئازارەكانی جەستەی هێور كاتەوە.

٢-٥. سۆریكە Measles

نەخۆشیەكی ڤایرەسیی زۆر درمە. سۆریكە لەنەخۆشیەكانی منداڵانە و پتر لە ٩٠٪ منداڵان پێش تەمەنی پازدە ساڵیان تووشی دێن، بەڵام

لەهـەموو تەمەنێکیـشدا پەیـدا دەبـێ. نەخۆشـی سـۆریکە وەکـو پەتایـەك هـەر دوو یـان سـێ سـاڵان جارێك بڵاودەبێتەوە، بەتایبەتی لە وەرزەکانی بەهار و زستانان دا.

هۆکـار: ڤایرەسـی سـۆریکە بـە رێگـەی ئـەو پڕیـشکانەوە بڵاودەبێتـەوە کـە لـە لـووت و گـەرووی نەخۆشـەوە لـەکاتی پشمین و قسەکردندا دێنـە نـاو هـەواوە. هـەروەها لـە رێـی کەلوپـەلی بـەکارهێنراوی نەخۆشیـــشەوە، وەك: خـــاولی و دەستەســـڕ... دەگوازرێتەوە. پەتایەکە لە قوتابخانەوە سەرهەڵدەدا و قوتابیەکان بۆ خوشك و برا و ئاوقـەرانی خۆیـانی دەگوازنەوە لەکاتی یاریکردن لەگەڵ یەکتریدا.

ماوەی دەرکەوتنی نیشانەکانی لـەنێوان حـەفت و چـوارده رۆژ دایـە و بـە تێکـڕا یـازدە رۆژە. نـەخۆش پێش دەرکەوتنی پەڵە لەسەر پێـستی بە سـێ رۆژ و تا دوای رەشبوونەوەی ئەو پەڵانەش هەر بۆ خـەڵکی

دیکـەی دەگوازێتــەوە، واتــە بــۆ یــەك حەفتــە دوای نــەمانی پەڵــەی ســەر پێــست. یــەکێك کــە جارێــك تووشی سۆریکە دیٚ بەرگریـەکی ئـەوتۆ پەیـدا دەکـا کــە جــارێکی دیکــە نایگرێتــەوە، بــەڵام تووشــی ســـۆریکەی ئـــەڵمانی دەبـــیٚ چـــونکە ئـــەوەیان نەخۆشیەکی دیکەیە.

نیشانەکان: سۆریکە دوو قۆنـاغی هەیـە: قۆنـاغی یەکـەمی زۆر بـە هەلاّمـەت دەچـیٚ چـونکە منداڵەکـە هەســـت بـــەئازار و کۆخـــە و پـــشمین دەکـــا و ئـــاو لـەلووتی دێتـە خـواریٚ و سـەر و پـشتی ژان دەکـەن. لەوانەیە ناوچاوەکانی سوور ببنـەوە و لـە روونـاکی بترســیٚ و پلــەی گــەرمی لەشیــشی کــەمێك بــەرز دەبێتەوە.

قۆنـاغی دووەم: لـە رۆژانـی سێیەم و چوارەمەوە دەسـت پێـدەکا کـە پلـەی گـەرمیی لەشـی زۆر بـەرز دەبێتەوە و "پنتکی کۆپلیـك Koplik's spots" کـە

دەڵێــی دەنکۆڵـەی خـوێی سـپیە لـەناوەوەی گـوپی دەردەکـەون. ئـەوجا یەکـەمجار پەڵـە لەسـەر پێسـتی نێوچەوان و دواوەی گوێیەکانی پەیدا ... پاشان لــەماوەی (٣٦) کاتــژمێردا بەهــەموو ... ــتەیدا بلاودەبنەوە. پەڵەکان سـەرەتا وەکـو پنتکـی سـوورن پاشــان گــەورەتر دەبــن. لــەم کاتــەد کــە پەڵــەکان بلاودەبنەوە تایەکەی نامێنێ ئەوجا رەنگی پەڵەکان تاریکتر دەبن و وردە وردە رەش دەبنەوە (نامێنن).

چارەســەری: لــەماوەی هــەبوونی تــا و پەڵــەی پێـستدا دەبـێ منداڵەکـە لـەناو جێـدا بمێنێتــەوە. لەوانەیــە پزیــشك پێــی باشــبێ دەرمــانی وەك: ئەسـپرین و دڵـۆپی نـاو لـووت و هــی دژە کۆخــەی بدرێتێ. خواردنیشی دەبێ شلەمەنی بێ و رووناکی لەژوورەکەی کەم بکرێتەوە و هەواگۆڕێکی ناوە ناوە بۆ بکرێ.

سۆریکە بەرگریی لەش کەم دەکاتەوە بۆیە تووشی سووتانەوەی لوولەکانی هەناسە و سیپەلاکەکان و گوێ و هیدیکەش دێ. کە ئەو دەردانەشی لێ پەیدا دەبن پێویستە پزیشک بیپشکنێ و چارەی بکا.

خۆپاراستن: دوو جۆرە خۆپاراستن ئێستا بۆ منداڵان هەیە. یەکێکیان ئەو بەرگریەیە کە لەدایکیەوە بۆی دەچێ و تا مانگی نۆیەمی تەمەنی بەردەوام دەبێ. دووەمیش ئەوەیە کە بەکوتان لەدژی سۆریکە لەمانگی نۆیەمی تەمەنی دەیدرێتێ و تا ماوە بەرگریی پێ دەبەخشێ.

## ٢-٦ سۆریکەی ئەڵمانی German Measles

نەخۆشیەکی ڤایرەسیی درمە کە هەر لەرێی بەریەککەوتنەوە بڵاودەبێتەوە. لەناو تەمەن سێزدە و دوازدەساڵیاندا زۆرتر دەبینرێ و بە سۆریکەی سێ رۆژەش ناودەبرێ چونکە تونیەکەی

ناوەنجیە، بەڵام ئەگەر ئافرەتێك لەکاتی مانگەکانی سەرەتای دووگیانیی تووشی بێ، ئەوا کۆرپەکەی ناو زگی تووشی زۆر ناتەواویی جەستەی دەبێ.

درمیەتی ئەم نەخۆشیە بەهەمان توندیی خوریکە و سۆریکە نیە، بەڵام بەزۆری بەشێوەی پەتا لەناو منداڵانی قوتابخانەکاندا بڵاودەبێتەوە، بەزۆریش لەوەرزی بەهار یان لەسەرەتای وەرزی هاویندا زۆرتر پەیدا دەبێ. ئەو ڤایرەسەی نەخۆشیەکە پەیدا دەکا بە بەریەککەوتن و بەپڕیشکی پشمین و کۆکەی نەخۆشیش بڵاو دەبێتەوە. نەخۆش هەر لەو کاتەی نیشانەکانی لێ دەردەکەون تا پەڵەکانی پێستی رەش دەبنەوە هەر بۆ خەڵکی دیکەی دەگوازێتەوە. ئەو ماوەیەش سێ تا چوار رۆژان دەخایەنێ. ماوەی دەرکەوتنی نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە لە رۆژی گرتنی میکرۆبەکەوە لەنێوان چواردە و نۆزدە رۆژ دایە.

نیشانەکان لەسەر شێوەی سەرمابوونێکی سووک دەردەکەون کە سووکە تایەك و ئازاری گەرووی دەبێ. لەوانەیە گلاندە لیمفاویەکانی کە دەکەونە پشت مل و گوێیەکانی کەمێك بئاوسێن. لەمەشەوە لەکاتی جوولاندنی سەری هەست بەئازار دەکا.
پەڵەکانی پێست سەرەتا لە دەموچاو و چەرمی سەری دەردەکەون، پاشان و لەهەمان رۆژدا بەسەر جەستە و باسکەکانی دا بلاودەبنەوە. پەڵەکانی سۆریکەی ئەڵمانی دوای دوو یان سێ رۆژان رەش دەبنەوە هەرچەندە لەهەندێك باری کەمدا بۆ ماوەی حەفتەیەك درێژە دەکێشن.

چارەسەری و خۆپاراستن: نەخۆش پێویستە لەناو جێگەدا بمێنێتەوە تا نیشانەکانی نامێنن، بەلام مەرج نیە چارەسەری وەك دەرمان یان خواردنێکی تایبەتی وەرگرێ ئەگەر تایەکەی زۆر بەرز نەبوو.

لەكاتی دووگیانیدا: ئەگەر ئافرەتێك لەكاتی سێ مانگی یەكەمی دووگیانیی دا تووشی سۆریكەی ئەڵمانی بوو ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە كە كۆرپەكەی تووشی مەترسیەكی گەورە بێ. لەناو ئەو ناتەواویە جەستەییانەی كاتی دووگیانی كە هۆكارەكەی بۆ تووشبوون بە سۆریكەی ئەڵمانی دەگەڕێنرێتەوە: تانەی سەرچاو، كەڕولاڵ بوون، ناتەواوی دڵ، بیركولی. لەكارە لابەلاییەكانی دیكەی ئەو نەخۆشیە لەكاتی دووگیانیدا منداڵ لەبەرچوونە. لەبەر ئەم مەترسیانە پزیشكان هەندێك جار ئامۆژگاری كچۆڵان دەكەن كە خۆیان تووشی نەخۆشیی سۆریكەی ئەڵمانی بكەن چونكە ئەوە وادەكا بەرگریەك بە جەستەیان ببەخشێ بۆ ژیانی دوا رۆژیان (ئێستا كوتان بۆ ئەو نەخۆشیە هەیە و كچان بەتایبەتی لەتەمەنی قوتابخانەدا پێی دەكوترێن. و.).

## ٧-٢. گرانەتا Typhoid Fever

نەخۆشیەکی درمی بەکتریاییە کە لە ڕێی ئاو و شیر و خواردنی دیکەوە دەگوازرێتەوە. میکرۆبی ئەم نەخۆشیە لەلایەن مێشی ناوماڵەوە بۆ سەر خواردن و ئاو دەگوازرێتەوە کاتێك کە بەسەر پاشەڕۆکەکانی نەخۆش و هەڵگری ئەو میکرۆبەوە دەنیشێتەوە. لە شارەکاندا ئەوانەی کە هەڵگری ئەو میکرۆبەن و لەئامادەکردنی خواردن خواردنەوە و لە سەوزەچاندندا کار دەکەن، دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشیە.

میکرۆبە چوکڵەییەکانی گرانەتا دەچنە ناو کۆئەندامی خواردن و لەوێشەوە دەچنە ناو خوێن و تێیدا زۆر دەبن و نیشانەکانی لە ڕیخۆڵەدا لەگەڵ تاهاتن دەردەکەون. ماوەی دەرکەوتنی نیشانەکانی لە (١٠) ڕۆژ بۆ (١٤) ڕۆژە. پاشان میکرۆبەکان لەناو ڕیخۆڵەی باریکە و تورەگەی زراودا نیشتەجێ دەبن.

نیشانەکان: یەکەمین نیشانەی گرانەتا سەرئێشە و هەندێك جار سووتانەوەی گەرووە لەگەڵ تایەك کە دەگاتە (٤٠) پلەی سەدی، پاشان پلەی گەرمیەکەی وردە وردە بەرز دەبێتەوە تا لە (٧ – ١٠) رۆژاندا دەگاتە ئەوپەڕی. دوایی وردە وردە لەحەفتەی چوارەمدا دێتەوە خوارێ. بەدەگمەن نەخۆش تووشی لەرز و عارەقەکردن و نەمانی حەزچوونە خواردن دێ. جووڵەی دەردانی پاشەرۆك لەنەخۆشێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆرێ. لەکاتێکدا هەندێك تووشی زگچوونێکی شلی رەنگ سەوز دێن، هەندێکی دیکە دەگیرێن. پەڵەی رەنگ سوور لەدوای دوو حەفتان لەسەر سینگ و زگ پەیدا دەبن. لە جۆرە توندەکانی دا نەخۆش هورێنە دەکا و چاوی لەئاسمان زەق دەکاتەوە. لە حەفتەی سێیەم یان چوارەم باشتر دەبێ بەلاّم نەخۆشیەکە بەترسە و ئەگەر چارە نەکرێ دەیکوژێ.

گواستنەوەی نەخۆشیەکە: ئەوەی تووشی گرانەتا بیٚ بەرگری پەیدا دەکا و بۆ جاری دووەم تووشی نایێ، بەلاٚم لەوانەیە میکرۆبەکە هەڵبگریٚ و بە ریٚگەی میز و پیسایی بیگوازیٚتەوە بۆ هیدیکە. دوور نیە میکرۆبەکە لە ئاودەستەکانەوە لە ریٚی ئاوی ژیٚرزەویەوە بۆ بیرەکانی ئاوی خواردنەوە بگوازریٚتەوە بەمەش پەتایەکی ناوچەیی دەنیٚتەوە. هەروەها میکرۆبی گرانەتا لەناو توورەگەی زراوی هەڵگریشدا دەژی، بۆیە پیٚویستە لەو کەسانە بە نەشتەرگەری توورەگەی زراو هەڵبگیریٚ.

خۆپاراستن و چارەسەری: لەو ناوچانەی کە هیٚشتا بەتەواوی ریٚوشویٚنە تەندروستیەکان نەگیراونەتە بەر بۆ نەهیٚشتنی گرانەتا، پیٚویستە هەر کەسیٚکی کە دەچیٚتە ئەو ناوچانە بەماوەیەکی باش پیٚش گەیشتنی، خۆی لەدژی گرانەتا بکوتیٚ و هەر سیٚ ساڵیش جاریٚك دووبارە خۆی بکوتیٚتەوە.

ئەوانەش کە نەکوتراون دەبێ خۆیان لەنەخۆشەکانی گرانەتا بپارێزن و نەخۆشەکانیش لە نەخۆشخانەی تایبەتی تادارانددا جودا بکرێنەوە.

## ٢-٨. زگچوون و دیزانتریا Dysentery

میکرۆبێکە تووشی ریخۆڵەکانی لای خوارەوە دێ کە بە بەکتریا یان مشەخۆرە تاك خانەییەکان یان بەهۆی ڤایرەسەوە پەیدا دەبێ و زگچوون و زگئێشەی لەگەڵدا دەبێ. لە شیرەخۆرە و منداڵاندا رەنگە بەترس بێ، بۆیە باشترە ئەگەر زگچوونی توند لەمنداڵێکی ساوا دا پەیدا بوو بە دیزانتریا دابنرێ تا پێچەوانەکەی دەسەلمێنرێ.

دیزانتریا بەوە دەناسرێ کە پیساییکردن زۆرجارە و بەشێوەیەکی نائاسایی شل دەبێ. هەروەها تا و پێچکردنی گەدە و خۆگوشینێکی نائاسایی دەوێ بۆ بەتاڵکردنی ریخۆڵەکان. لەگەڵ ئەوەشدا بڕێکی کەم لەپیسایی دەردەدا. بەزۆریش

پیسایییەکەی کێم و چڵمی تێدا دەبێ و لەوانەیە خوێنیش دابنیشێ.

گەورەترین مەترسی زگچوون ئەوەیە کە گەشەی منداڵ کەمدەکاتەوە چونکە ئەو پیسایییە شلەی کە وەکو ئاوە و زوو زوو دەردەچێ، وەنەبێ هەر ئاوی لەش کەم بکاتەوە بەڵکو مادەی کیمیاویی بەسوودیشی لێ دەستێنێ. لەبارە توندەکاندا پزیشك شلە و خوێ و مادەی کیمیاویی دیکە لە ڕێی خوێنهێنەرەوە دەداتە نەخۆش بۆ بەهاناهاتنی.

لەگەڵ ئەوەی نەخۆشی دیزانتریای ئاسایی چەند حەفتەیەکی کەم درێژە دەکێشێ ئەگەر بە دەرمانی تایبەتی خۆی چارە نەکرێ، بەلاّم ئەو نیشانانەی کە لە برینەکانی ناو ریخۆڵەکان و زگچوون و پێچکردنە بەئازارەکانی کە لەکاتی پیساییکردندا پەیدا دەبن، لەوانەیە بۆ ماوەی درێژتریش بەردەوام بن.

## ٢-٩. تـــای شـــەپۆڵدار (لەوانـــە: تـــای ماڵتـــا) Undulant fever – Malta Fever

نەخۆشـــیەکە کـــە میکرۆبـــی (برووســـیلا) هۆکاریـــەتی. لەگیانـــدارانی وەك بـــزن و چـــێڵ و بەرازەوە دەگوازرێتەوە. ئەم نەخۆشیە بۆیە بە تای شـــەپۆڵدار نـــاودەبرێ چـــونکە تایەکـــەی لـــەماوەی جیاوازدا وەکو شەپۆڵ بەرز و نزم دەبێتەوە.

بەکتریایەکـــە لەئاژەڵێکـــەوە بـــۆ یـــەکێکی دیکـــە دەگوازرێتەوە، پاشان لە رێـی خـواردن و خواردنـەوە پیـــسبووەکان بـــەو بـــەکتریا، وەك: گۆشـــت و شـــیر و پەنیرە... تووشی مرۆڤ دێ. هـەروەها بەتێکـەڵبوونی مـــرۆڤ و گیانـــداران دەگوازرێتـــەوە و یەکـــەمین کەسـانێکی کـە دەیگـرن کرێکـارانی کـشتوکاڵ و شـــوێنی ســـەربڕینی ئـــاژەڵان و گۆشـــتفرۆش و کارمەنـــدانی ڤێتەرنـــەرین (بەیتـــەرە). بەدەگمـــەن

نەخۆشـیەکە لەمرۆڤێکـەوە یەکـسەر بـۆ مرۆڤێکـی دیکە بگوازرێتەوە.

جۆرەکـانی تـا: هەریـەك لـە بـزن و چێڵ و بـەراز جـۆرێکی دیـاریکراو لـە بـەکتریای تـای شـەپۆڵدار هەڵـدەگرن. ئەوانـەی شـیری بـزن دەخۆنـەوە تووشـی جۆری یەکەم دێن کە پێی دەگوترێ (تایماڵتا) یـان (تـای دەریـای ناوەڕاسـت) چـونکە لـەو ناوچـەیە زۆر بلاّوە.

ئەوانەی شیری چێڵ دەخۆنەوە تووشـی جـۆرێکی دیکە دێن کە پێی دەگوترێ (تای لەباربردن) چـونکە دەبێتـە هـۆی لەبارچـوونی بێـچووی چـێڵەکان و زیانێکی گەورە بەسامانی ئاژەڵ دەگەیـەنێ. جـۆری سـێیەم کـە لەبەرزدایـە تایـەکی مەترسـیدار پەیـدا دەکا.

نـــەخۆش کێـــشی دادەبـــەزێ و لەســـەرەتای نەخۆشیەکەیدا تووڕەیی دەیگرێ، پاشان سەرئێشە

و لەرز و عارەقە دەکا لەگەڵ ئازار لەماسوولکەکانی.
لەوانەیە ئەم نیشانانە بۆ چەند ساڵێك درێژە بکێشن، چ بە پچڕپچڕی یان بەبەردەوامی، بەڵام زۆربەی نەخۆشەکان لەماوەی دوو و شەش مانگدا چاك دەبنەوە. پشکنینی تایبەتی خوێن هەیە بۆ دڵنیابوون لەدەستنیشانکردنەکەی. دەرمانەکانی دژەژیان لەگەڵ حەسانەوەی تەواو و خواردنی ڤیتامینەکان یارمەتی زوو چاکبوونەوە دەدەن.

### ٢-١٠. پەنگرەپیسە Anthrax

پەنگرەپیسە (الجمرە الحبیپە) لە نەخۆشیەکانی گیاندارانە و بۆ مرۆڤیش دەگوازرێتەوە. هەرچەندە ئێستا زۆر دەگمەن بووە بەڵام نەخۆشیەکی بەترسە. ئەگەر زوو نەدۆزرێتەوە و چارەنەکرێ دوور نیە ببێتە هۆی مردن. پەنگرەپیسە تووشی مەڕومالاًت و رەشەولاًغ و هەندێك جۆری دیکەی گیانداران دێ. بەزۆری کاتێك بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە کە میکرۆبە

شێوە چوکڵەییەکە یان خڕۆکە سپۆرکردووەکەی کە لەسەر مووی یان پێستی یان بەشی دیکەی جەستەی گیاندارە تووشبووەکە دایە، دەتوانێ لە ڕێی برینێکی پێستی مرۆڤەوە بچێتە ناو جەستەیەوە. ئەگەر ئەو سپۆرانە لەگەڵ هەناسە هەڵمژران ئەوا تووشی سیەکان دێ و جۆرێك لەو پەنگرەپیسە پەیدا دەکا کە پێی دەگوترێ (نەخۆشیی پەڕەچیان).

نیشانە دیارەکانی ئەو نەخۆشیە خورشت و هەستەوەریەکی توندە لەگەڵ دەرکەوتنی جۆرێکی تایبەت لەبرین کە پێی دەگوترێ (قینچکەی پیس) لەسەر پێست پەیدا دەبێ. ئەو گرێ لیمفاویانەی کە لێی نزیکن دەئاوسێن. لەوانەیە تا و هێڵنج هاتنی لەگەڵدا بێ. ئەم نەخۆشیە بەزۆری لە ڕێی دەرمانی دژەژیانی تایبەت یان (سولفا) چارە دەکرێ. (تێبینی: لەم نامیلکەیەدا زۆرجار ناوی سولفا

دووبـــاره دەبێتـــەوە. لەڕاســـتیدا ئێـــستا لەبـــەر پەیـدابوونی دەرمـانی باشـتر، دەرمـانی سـولفا بـۆ چـارەکردنی نەخۆشـیان ئەوەنـــدە بـاوی نـــەماوە. وەرگێڕ).

### ٢-١١. ئەنفلەوەنزای باڵندان

ئـــەو ڤایرەســانەی ئەنفلـــەوەنزا کـــە هەڵامـــەتمان تـووش دەکـەن بـۆ چـەند جۆرێـك دابـەش دەکـرێن، وەك: A و B و C، بەڵام بەشی زۆریان لەجۆری A یە کە ئـەویش بـۆ ١٥ پـۆلی دیکـەی نـاونراو بـە H و نـۆ پـۆلی دیکـەی نـاونراو بـە N دابـەش دەبـن. هـەردوو پـۆلی H5 و H7 دەبنـە هـۆی نەخۆشـی ئـەوتۆ کـە رێـژەی مـردن تێیـدا لـەنێوان ٩٠ و ١٠٠ لەسـەدایە. ڤایرەســەکە لــە رێگــەی بەرکــەوتنی راســتەوخۆی هەناسە و پیسایی لەناو گیانداراندا بلاو دەبێتـەوە، یان بە رێگەیەکی ناڕاستەوخۆ لە رێی ئاو و ئالیك و ئـــەو ئـــامراز و جلوبەرگانـــەی کـــە بەخێوکـــەران و

کرێکارانی ناو تەویلەی گیانداران بەکاریان دێنن. بەزۆری باڵندە کێویەکان ئەو ڤایرەسانە هەڵدەگرن، بەلاّم هیچ نیشانەیەکی نەخۆشیەکەیان لێ دەرناکەوێ. بەرکەوتنی ئەو باڵندانە بە پەلەوەرانی ماڵی، دەبێتە هۆی بلاّوبوونەوەی ئەم نەخۆشیە.

ئایا ئەم ڤایرەسە لە گیاندارانەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە؟ وا دەبێ ڤایرەسی جۆری A لەپۆلی N1/H5 لەگیاندارەوە بۆ مرۆڤ بچێ، وەك ئەوەی لە کیشوەری ئاسیا و لە هۆڵەندا بەپۆلی N7/H7 روویدا. ئەم دەردە وەکو پەتا کاتێك بلاّودەبێتەوە کە بەریەکەوتنێکی گەورە و دووروودرێژ و بەردەوام هەبێ، وەك ئەوەی لەگەڵ کرێکارەکانی ئەم بوارەدا دەبێ یان لەگەڵ ئەوانەی پەیوەندیان پێیانەوە هەیە، وەك: بەخێوکەر و تەکنیکاران و پزیشکانی ڤێتەرنەری و تیمەکانی خاوێنکردنەوە.

ئایا ڤایرەسەکە لەمرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگوازرێتەوە؟

هیچ بەڵگەیەك نیە بۆ گواستنەوەی پۆلی N1/H5 لەمرۆڤەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە بەلاّم لەهەندێك باری کەمدا گومانی ئەوە هەیە.

نیشانەکانی ئەنفلەوەنزای باڵندان چین و پەتایەکە چۆن روودەدا؟

لەناو نیشانەکانی ئەنفلەوەنزا ناوی ئەوانە دەینین:

دەرکەوتنی کتوپڕی ئەمانە لەچەند کاتژمێرێکدا یان کەمتر لەکاتژمێرێك: تا و لەرز، کۆکە و ژانەسەر، ماندووبوون و شەکەتی جەستە (نەخۆش هەست دەکا هەموو جەستەی شکاوە).دوای هەفتەیەك لەوە نەخۆشیەکە دەچێتە قۆناغی ئاسایی خۆی کە دەردەکەیە (تایەکەی دەگاتە ٣٨ پلە و پتریش، ئازاری لە گەروو و ماسولکەکان دەبێ و گرفتی

لەهەناسەدان بۆ پەیدا دەبێ و کۆخەش دەگرێ).
دوایی نەخۆشییەکە خێرا پەرە دەستێنێ و نیشانەکانی زۆرتر دەبن و هەناسەدانی زەحمەت دەبێ.

ئایا چارەسەریەکی بنبڕ یان خۆپاراستن هەیە بۆ مرۆڤ؟

دوو جۆرە دەرمان بەکار دەهێنرێ:

دژەپرۆتینەکانی ڤایرەسەکە M2 کە ڤایرەسی جۆری A دەپارێزێ، بەڵام کاری لاوەکیی هەیە بۆ گورچیلە و جەرگ و دەمارەکان. هەروەها ڤایرەسەکە بەخێرایی بەرگری بۆ ئەو دەرمانانە پەیدا دەکا.

راگرەکانی ئەنزیمی نیورامینیدەیز neuraminidase inhibitors: وەکو دەرمانی تامیفلوو Tamiflu کە لەکەمکردنەوەی توندی و ماوەی نەخۆشیەکە سەرکەوتووە ئەگەر لەماوەی

دوو رۆژی یەکەمی دەرکەوتنی نیشانەکانی بەکار بهێنرێ (لەماوەی ٤٨ کاتژمێر، تا زووتربێ ئەوەندە ئەنجامەکەی باشتر دەبێ). ئەگەر پێش تووشبوونیش بەکارهات ئەوا بۆ خۆپاراستن لەڤایرەسەکە سوودی دەبێ، چونکە ئەم دەرمانە لەکاتی بڵاوبوونەوەی پەتا زۆر باشە بەتایبەتیش کە بەکارهێنانی ئاسانە.

هەرچی دەرمانە دژە بەکتریایەکانە ئەوا هیچ کاریگەریەکیان بۆ سەر ڤایرەسەکە نیە چونکە تایبەتن بە بەکتریا نەك ڤایرەسان، بەڵام رەنگە لەو کاتانە سوودیان هەبێ کە نەخۆشیەکە بەکتریاشی دێتە سەر یان بۆ رێگرتن لەتووشبوون بە بەکتریا.

ئایا ئەگەری تووشبوون هەیە دوای خواردنی گۆشت و هێلکەی باڵندان؟

گواستنەوەی ڤایرەسەکە بە رێگەی هەواوە دەبێ. هەرچی تووشبوونە بەخواردنی گۆشتی باڵندەی

دەردەدار ئــەوا ئەگــەرێکی زۆر لاوازە و پــشتگوێ دەخرێ چونکە ڤایرەسەکە بە گەرمی لـە (٦٠) پلـەی سەدی پـتر بۆ ماوەی (٥) خولەك لەناو دەچێ و بە تـەنیا یـەك خولەکیـشی دەوێ ئەگـەر لەپلـەی (١٠٠) سەدیدا بکوڵێنرێ. لەلایەکی دیکەشـەوە ڤایرەسەکە بــەبێ کولاّنــدنیش هــەر لــەناو گــەدە بــەهۆی ترشەڵۆکەکەیەوە تێك دەشکێنرێ.

چۆن رێگە لە بڵاوبوونەوەی ئەنفلەوەنزای باڵندان دەگیرێ؟

بــۆ رێگــرتن لەبڵاوبوونــەوەی پێویــستە ئەوانــە بکرێ:

- دوورخــستنەوەی گیانــدارە تووشــبووەکان لەشوێنێکی بەتەنیا و دوایی لەناوبردنیان.
- پاککردنەوەی ئامرازە بەکارهاتووەکان ئەگەر دووبارە بەکارهێنرانەوە.

- جوداكردنەوەی گیانداران لەیەكتری بەپێی جۆرەكانیان و بۆ بەخێوكردنیان هەر جۆرە و لەگەڵ هی وەك خۆی.
- هاندانی پەروەدەكارانی ئەو گیاندارانە بۆ یەكسەر راگەیاندن و ئاشكراكردنی هەر تووشبوونێك كە لەناو پەلەوەرەكانیان دەردەكەوێ.

٢-١٢. سارس (كۆنیشانەی سووتانەوەی تیژی رێبازی هەناسەدان)

كۆنیشانەی سووتانەوەی تیژی كۆئەندامی هەناسەدان SARS بریتیە لەنەخۆشیەكی ڤایرەسیی درم كە تووشی كۆئەندامی هەناسەدان دێ.

نیشانەكانی: ئەو دەردە بەگشتی بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش بۆ پتر لە ٣٨ پلەی سەدی دەست پێدەكا. لەوانەیە نیشانەی دیكەی وەكو سەرئێشە و هەستكردن بەنەبوونی حەوانەوەی گشتی و ئازار لەهەموو جەستەدا.

هەندێك لە تووشبووان نیشانەی سووك لە هەناسەدانیاندا دەردەکەوێ. دوای ماوەی دوو یان حەفت رۆژان نیشانەکانی هەناسەدان پەرەدەسێنن و کۆخەیەکی وشك (بێ بەڵغەم) و هەناسەتەنگی پەیدا دەبن. ماوەی مانەوەی ڤایرەسەکە (کورکبوون یان کڕکەوتن)، (واتە لەکاتی تووشبوون تا دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشیەکە) لەنێوان حەفت و دە رۆژان دایە. دوای ئەوە نیشانەکانی نەخۆشیەکە دەردەکەون.

رێگەکانی بڵاوبوونەوەی: وادەردەکەوێ کە رێگەی سەرەکی بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی سارس بەریەککەوتن و بەیەکگەیشتنی نزیکە لەگەڵ تووشبووان. چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی کە تووشی سارس هاتوون لەوانە بووینە کە چاودێری یەکێکی تووشبوو بەم نەخۆشەیان کردووە یان لەگەڵیدا ژیاون. یان بەرکەوتنێکی راستەوخۆ

هەبووە بەو ئامرازانەی کە ڤایرەسەکەی پێوە لکاوە (وەك دەردراوەکانی کۆئەندامی هەناسەدان) لەلایەن نەخۆشەوە.

ڕێگە چاوەڕوانکراوەکان بۆ بلاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیە بریتین لە دەستدانە پێستی کەسێکی دیکە یان کەلوپەل پیسبوون بە پڕیشکی دەمولووت، پاشان دەستدانە چاو و لووت و دەم. ئەمە لەوانەیە لەکاتی پشمین یان کۆخەی نەخۆش رووبدا کاتێك کە پڕیشکەکانی دەمی بەسەر جەستەیدا بلاودەبنەوە یان بۆ خەڵکانی دیکە و دەوروپشتی دەچن. لەوانەشە ڤایرەسی سارس بەشێوەیەکی گشتی لە ڕێی هەوا یان بەرێگەی دیکەش بگوازرێتەوە کە هێشتا نەزانراوە.

**ئایا من مەترسی تووشبوونم هەیە؟**

ئەوانەی کە تا ئەمڕۆ دۆزراونەتەوە بەشێوەیەکی سەرەکی لە بەریەککەوتن و پەیوەندی ڕاستەوخۆوە

روویان داوە، وەکو لەو کەسانەی کە کەلوپەلی هەمان کەس بەکار دەهێنن یان ئەوانەی لەبواری تەندروستیدا کار دەکەن و ڕێنماییەکانی خۆپاراستن لەو نەخۆشیە پەیڕەو ناکەن لەو کاتانەی کە کاری خۆیان بەجێ دەگەیەنن و چاودێریی نەخۆشانی تووشبوو بەم ڤایرەسە دەکەن.

هۆکاری سارس چییە؟

زانایان ڤایرەسێکیان دۆزیوەتەوە کە پێشتر نەناسرابوو (پێش بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە نەدۆزرابۆوە). ئەم ڤایرەسە لەبەرەبابێکی ڤایرەسانە کە پێی دەگوترێ کۆرۆناڤایرەس Coronavirus. بەڵام ڤایرەسەکانی دیکەش لەژێر لێکۆڵینەوە دان چونکە ئەگەری ئەوە هەیە ئەوانیش هۆکاربن.

## ٢-١٣. سووتانەوەی جەرگ Hepatitis

لەوانەیە ئەو سووتانەوەیە تیژ یان ڤەکێش بێ.

سووتانەوەی تیژی جەرگ: ئەم جۆرە سووتانەوانە لەماوەی کەمتر لە سێ مانگان پەرەدەسێنن و زۆر هۆکاریان هەیە، لەوانە:

- سووتانەوەی جگەر بەڤایرەس: بلاوترین سووتانەوەکانی جگەرە و هۆکارە سەرەکیەکەشی ڤایرەسەکانی جۆری A, B, C یە و هەندێك جار هیدیکەی وەك ڤایرەسی D و E.
- سووتانەوەی جەرگ بە ژەهر و دەرمانان: ئەمەش لەخواردنی دەرمانەکانی دژەژیان و ئەوانەی بۆ سیل بەکار دەهێنرێن و پاراسیتۆل و لەخواردنی هەندێك هۆرمۆنیش پەیدا دەبن. لەوانەیە هەندێك ژەهری وەك (ئەمانیتین) و (ئەمانایت) و (لۆبید) ببنە هۆی تێکدان و کاولکردنی جەرگ.

- سووتانەوەی جەرگ بە ئەلکهوول: زۆر بە سووتانەوەکانی جگەری بەژەهر دەچێ. ئەگەر ژەهراویبوونەکە درێژەی کێشا ئەوا دوورنیە شانەکانی جەرگ لەناو ببا. هەر ئەو لەناوچوونەشە کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی ئەوەی کە بە بەشەمێبوونی (تشمع) جەرگ ناسراوە.
- سووتانەوەی جگەر بە بەکتریا و مشەخۆران: ئەمە لەئەنجامی تووشبوون بەهەندێك نەخۆشیی درمەوە پەیدا دەبێ.
- نیشانەکان: ئەو نیشانانە جێگیر نین و توندیەکەیان دەگۆڕێ. هەندێکیان لەهەموو جۆرەکانی سووتانەوەی جگەردا هەن، وەك: زەرتك، میزی رەنگ قاوەیی، پیسایی رەنگ کاڵ، هێڵنجهاتن و هەستیاربوونی جەرگ بۆ دەست لێدان. هەندێك نیشانەش هەن کە لەگەڵ هۆکارەکەی رێك دەکەون.

- پەرەسەندن و چارەسەری: بەزۆری سووتانەوەکانی جگەر بەڤایرەس کۆتاییەکی باشیان هەیە و پێویست بەهیچ چارەسەریەك ناکەن بێجگە لە نەخواردنەوەی ئەلکهوول و ئەو دەرمانانەی کە بەناو جەرگدا تێدەپەڕن و لەوێ شیدەکرێنەوە. لەوانەشە هەندێك جار بۆ جۆری ڤەکێش پەرەبسێنن وەك لە سووتانەوەکانی بە ڤایرەسی B و C. دوورنیە هەندێك جاریش ببێتە هۆی مردن و پێویست بەوە بکا کە جەرگێکی دیکەی بۆ بچێنرێ (بۆی بگوازرێتەوە).

سووتانەوەی ڤەکێشی جگەر: ئەگەر تەمەنی سووتانەوەکەی جەرگ بووە شەش مانگ و پتر ئەوا بە ڤەکێش و درێژخایەن دادەنرێ.

چارەکردنی سووتانەوەی ڤەکێشی جەرگ بەوە دەبێ کە نیشانەکانی نەهێلرێ (گواستنەوەی خوێن بۆ نەخۆشەکە لەکاتی هەر خوێنبەربوونێك لەگەڵدە و

ریخۆڵەکانی، بۆ نموونە..) لەگەڵ بوونی هاوسەنگیەك لە خواردنەکانی (نەخۆش دەبێ هەندێك جۆرە ڤیتامین و کانزای بدرێتێ..).

مەترسیەکانی سووتانەوەی جگەر لەوەدایە کە لەکارکەوتنی جەرگ پەرەبسێنێ و چاکبوونەوەی نەبێ، کە ئەویش کۆمەڵێك نیشانەی خۆی هەیە، وەك: باش نەمەیینی خوێن، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن لەناو خوێنهێنەرەکانی کە بۆ جەرگ دەچن. ئەمانە بەڵگەی ئەوەن کە جەرگ بووە بە شەمێ و دووریش نیە بەشەمێبوونی جەرگ ببێتە شێرپەنجەش.

لەوانەیە سووتانەوە ڤەکێشەکانی جگەر لەخۆوە چاك ببنەوە یان بگۆڕێن بۆ بەشەمێبوون و شێرپەنجە. ئەوکاتە تاکە چارەسەری گواستنەوەی جەرگێکی ساغە بۆ نەخۆش.

## ٢-١٤. فەڕەنگی (سیلان) Gonorrhea

نەخۆشـیـەکی میکرۆبیـە زۆر بەتونـدی لـە ڕێـی پەیوەنـدی سێکـسیەوە دەگوازرێتـەوە و تووشـی ڕێبازەکـانی میزکـردن دەبـێ. لەهـەموو نەخۆشـیە سێکسیەکان باوترە.

هۆکـار: فـەڕەنگی بـەهۆی بەکتریایەکـەوە پەیـدا دەبـێ کـە پێـی دەگـوترێ (گۆنۆکۆکـەس) کـە شـێوەکەی خـڕە. ئـەوەی ئـەم میکرۆبـەی پـێ دەناسرێتەوە ئەوەیە کە هێرش دەباتە سەر پەردە لینجـەکانی نـاوەوەی ئەندامـەکانی میـز و زاوزێ و دەبێتـە هـۆی سـووتانەوەو کێمکردنیـان. لەتەمـەنی گەورانـدا نزیکـەی بەبـەردەوامی ئـەم نەخۆشـیە لەیـەکێکی تووشـبووەوە دەگیرێتـەوە، ئـەویش بـەجووتبوونی سێکـسی نـەك بـە ماچـکردن یـان دانیشتن لەئاودەستێك کە نەخۆش بەکاری هێنابێ و پیـسی کردبـێ. هەنـدێك جـاران میکرۆبـی

گۆنۆکۆکەس تووشی چاوەکانیش دەبێ و ئەگەر زوو چارە نەکرێ کوێرەی دەکا. ئەمەیان لەناو گەورانـدا زۆر بڵاو نیە، بەڵام منداڵان لەکاتی لەدایکبوونیاندا رەنگە تووشی ببن کاتێك کە بەناو رێبازی منداڵبوونی دایکێکدا تێدەپەڕن کە تووشی ئەو دەردە بووبێ. پێشان ئەو دەردە هۆکارێکی گرنگی کوێربوون بوو لەناو منداڵاندا بەڵام ئەمڕۆ لەزۆر وڵاتان بە قانون سەپێنراوە کە دەبێ پزیشکان چاوی هەموو ئەو منداڵانە لەو نەخۆشیە بپارێزن لەدوای لەدایکبوونیان.

نیشانەکان: بەزۆری نیشانەکانی سەرەتایی نەخۆشی فەرەنگی لەماوەی یەك حەفتە دوای تووشبوون بە میکرۆبەکە دەردەکەون، بەڵام ماوەی پەرەسەندیان رەنگە سێ حەفتان بخایەنێ. لەپیاواندا دوای دەستپێکردنی سووتانەوەکە بەشێوەیەکی گشتی نەخۆش هەست بە ئازارێکی

تیژ دەکا لەکاتی میزکردندا و کێم یان شلەیەکی سپیی چڕ لەگەڵ میزەکەی لەکونی ئەندامی نێرینەی دێتە دەرێ. ئەگەر بەبێ چارەسەری مایەوە ئەوا دەردانی کێمەکە پتر دەبێ و بۆ ماوەی دوو یان سێ مانگان بەردەوام دەبێ. پاش بڵاوبوونەوەی میکرۆبەکە بۆ شوێنی دیکە لەوانەیە تووشی سووتانەوەی (پرۆستات) و هێلکەگونەکان بێ و ببێتە هۆی نەزۆکی.

ئەگەر ژنان تووشی فەڕەنگی هاتن ئەوا لەوانەیە هیچ هەست بەئازار نەکەن و نیشانەی سەرەتاییشیان لێ دەرنەکەوێ. ڕەنگە ئازارێکی سووك لەبەشی خوارەوەی زگیان هەبێ و لەوانەیە لەکاتی میزکردنیش هەست بەسووتانەوە بکەن یان نەکەن، لەگەڵ دەردانی شلەیەکی سپی لەدامەنەوە. ئەگەر چارەنەکرا ئەوا میکرۆبەکە بۆ ئەندامەکانی دیکەی زاوزێ دەچێ و هێلکەدانەکان و کەناڵی

هێلکـەدان (کـەناڵی فـالووپ) تووشـی سـووتانەوە دەکەن و دوورنیە ببێتە هۆی نەزۆکیش.

ئەگـەر رێـی لێ نـەگیرێ ئـەوا میکرۆبەکـە کـار لەبەشـەکانی دیکـەی جەسـتە دەکـا. کـارە لابەلاییـە درێـژدادڕەکانی نەخۆشـی فـەڕەنگی بـریتین لەسـووتانەوەی میزڵـدان، گورچـیلەکان و رێکـە (بەشی کۆتایی ریخۆڵە گەورە). لەوانەیە ببێتە هـۆی سـووتانەوەی ئێـسکیش یـان میکرۆبەکـە هێـرش بکاتـە سـەر جومگەیـەك و تووشـی هـەوکردنێکی بەسفتوسۆی بکـا. ئەگـەر بڵاوبوونـەوەی میکرۆبەکە هـەر درێـژەی کێشا ئـەوا دوورنیـە بگاتـە پـەردەکانی مێـشك و نـاوزگ (پریتـۆن) و بگـرە دەبێتـە هـۆی مـردنیش ئەگـەر میکرۆبەکـە چـووە نـاو خـوێن و لەسەر زمانەکانی دڵ جێگیر بوو.

دەستنیـشانکردن و چارەسـەری: نەخۆشـی فـەڕەنگی دەکرێ بـەخێرایی چارە بکرێ و چاکیش

ببێتەوە، بەتایبەتی لەقۆناغەکانی سەرەتاییدا. پەنسیلین و دژەژیانەکانی دیکە و سولفاش بە چارەسەری کارا دەژمێردرێن ئەگەر لەژێر چاودێریی پزیشك بەکار هاتن.

## ٢-١٥. کووانی نەرم Chancroid

بە نەرمەکووان یان قورحەی نەرم و کووانی داخوراو و نەرمەبرینیش ناودەبرێ. نەخۆشیەکی بەکتریاییە تووشی کۆئەندامی زاوزێ دەبێ و لە رێی پەیوەندی سێکسی یان بەرکەوتنی راستەوخۆ بەبەکتریایەکەوە دەگوازرێتەوە. ناوی بەکتریایەکە Haemophilus ducreyi یە.

ماوەی کرکەوتن: بەو ماوەیە دەگوترێ کە دەکەوێتە نێوان تووشبوون بە میکرۆبەکە و دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشیەکە. ئەم ماوەیە لەنێوان رۆژێك و دوو حەفتە دایە.

نیشانەکان: نەخۆشیەکە تووشی ئەندامەکانی زاوزێ دێ و سەرەتا وەکو قینچکەیەك دەردەکەوێ کە بەشێوەی گرێیەکی بچووکی هەوکردووی سوورهەڵگەڕاو دەبێ کە پڕە لە کێم (خراج). ئەو کێمە هەر زۆر دەبێ تا قینچکەکە دەتەقێ و کێمەکە دێتە دەرێ و لەماوەی یەك رۆژدا شوێنەکەی دەبێتە کووان (برین).

ئەم برینە لەسەر ئەندامەکانی زاوزێکردندا دەردەکەوێ. لەپیاوان لەسەر چووك (ئەندامی نێرینە) و توورەگەی گوون دەبینرێ بەلاّم لە ژناندا لەسەر دوو لێوەکە و دەروازەی زێ و لەدەوروپشتی کونی کۆم و بەشی ناوەوەی رانەکانی دا دەردەکەوێ. ئەم کووانە داخوراوە Chancroid زۆر بە کووانی رەقی نەخۆشیی سووزەنەك Chancre دەچێ و بەئاسانی لێك جودا ناکرێنەوە. بەلاّم لە کووانی داخوراودا بنەکەی نەرم و تەڕە، هەر

بۆیەش بە کووانی نەرم ناونراوە، بەپێچەوانەی کووانی سوورزەنەك کە بنی کووانەکە ڕەقە بۆیەش پێی دەگوترێ کووانی ڕەق Hard Chancre.

لەنزیکەی ٥٠٪ ئەوانەی تووشی نەرمەکووان دێن گرێیە لیمفاویەکانی بەرزەهار و ئەوانەی لەناوچەکانی بەر دا هەن (لەنێوان ڕانەکان لەبەشی خوارەوەی زگ) تووشی هەوکردن دێن. ئەم گلاندە لیمفاویانە ئازاریان دەبێ و هەر گەورە دەبن تا دەتەقن و کێم و ئاوزڵزڵەیان لێوە دێتە دەرێ بۆ سەر پێست.

دەست نیشانکردن: بۆ ئەوەی بەبەڵگە بوونی کووانی نەرم بسەلمێنرێ پێویستە پارچەیەك لەبنکەکەی لێبکرێتەوە و بپشکنرێ. لەوانەیە نەرمەکووان هەر بە نیشانە کلینیکیەکانی لەگەڵ ئاوسانی گلاندە لیمفاوەیەکان دەستنیشان بکرێ پاش ئەوەی هۆکاری دیکەی ئەو کووانانە

بەدووردەخرێنــەوە، وەك: نەخۆشـیی سـووزەنەك و تامیسکەی سادە (هێرپس Herps).

دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ کـە نەرمـەکووان و کووانی نەخۆشی سووزەنەك مەترسی تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدز پتر دەکەن، بۆیە ئەوەی ئەم جۆرە کووانانەی هەیە پێویستە پشکنین بۆ ئایدزیش بکا.

چارەســـــەری: دەرمانـــــە دژەژیانـــــەکانی وەك: ئەزیترۆمایـــــــــــــــــسین Azithromycin و سیپرۆفلۆکـــــــــــــــساسین Ciprofloxacin و ئەریترۆمایـسین Erythrpmycin و سیفترایەکسۆن Ceftraiaxone بــەکاردەهێنرێن. کووانەکــە هــەر دوای حەفتەیـەك لەچـارەکردن بـەو دەرمانانــە بـاش دەبـێ، بـەلاّم لەشوێنەکەی قەتماغەیـەکی رەق بـەجێ دەمێنـێ. ئەگـەر لـەماوەی یـەك حەفتـە بـاش نـەبوو پێویستە نەخۆش سەردانی پزیشکەکەی بکاتەوە.

لەهەندێك باران دا پێویست دەکا گرێیە لیمفاویە هەوکردوو و ئاوساوەکان کە کێمیان تێدا کۆبۆتەوە بەدەرزی یان نەشتەرگەریەکی سووك دەربدرێن. دەبێ نەخۆش ئاگادار بکرێتەوە کە تا بەتەواوی چاك دەبێتەوە نابێ پەیوەندی سێکسی ببەستێ.

## ٢-١٦. سووزەنەك (سیفلس) Syphilis

نەخۆشیەکی درمە تووشی هەموو شانە و ئەندامەکانی جەستە دێ. هۆکاری نەخۆشی سووزەنەك جۆرە بەکتریایەکی شێوە سپرینگی پێچاوپێچە کە لە رێی پەیوەندیی سێکسیەوە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگوازرێتەوە. لە رێی پچڕان یان برینێکی رووکەشی سەر پێست یان لە پەردەی لینجی ناوپۆشی ئەندامەکانەوە دەچێتە ژووری. لەبەر ئەوەی ماوەی مانەوەی ئەم میکرۆبە لەدەرەوەی لەش لەچەند چرکەیەك تێناپەڕێ، بۆیە زۆر دەگمەنە لە رێی بەریەککەوتن و دەست لێدان و

خواردن و خواردنەوە لەناو کەلوپەلی بەکارهاتووی تووشبوو بگوازرێتەوە. هەروەها ئەستەمیشە لە رێی دانیشتن لەسەر کورسی دەستاو بگوازرێتەوە.

دەکرێ بەیەکجاری لەنەخۆشی سووزەنەك چاك بێتەوە، بەلاّم ئەگەر چارە نەکرا یان چارەکردنەکەی بەنیوەچڵی بوو ئەوا نەخۆشیەکە بلاّودەبێتەوە و هەموو جەستە لەناودەبا. نەخۆشی سووزەنەك بۆماوەیی نیە، بەلاّم لە دایکی تووشبووەوە بۆ کۆرپەڵەی ناو منداڵدانی دەگوازرێتەوە. هەر ئەمەشە کە پێی دەگوترێ "سووزەنەکی زگماك" کە لەکاتی لەدایکبوون یان دواتر لە منداڵەکە دەردەکەوێ.

سێ قۆناغەکانی سووزەنەك: نەخۆشی سووزەنەك بەسێ قۆناغدا دەڕوا کە نیشانەی جیاوازیان هەیە و یەك بەدوای یەك پێیان دەگوترێ: یەکەم و دووەم و سێیەم.

قۆناغی یەکەم: میکرۆبەکان دوای ئەوەی پێست یان پەردە لینجەکەی ناوەوەی ئەندامەکان دەبڕن، لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەگەنە ناو خوێن و نزیکەی دوای یەك حەفتە بەناو هەموو جەستەدا بڵاو دەبنەوە. یەکەم نیشانەی سووزەنەك لەم قۆناغەدا دەرکەوتنی کووانەکەیەتی کە پاش نۆ رۆژ یان سێ مانگ لەتووشبوون بە بەکتریایەکە دەبینرێ و بەتێکڕا ماوەکە سێ حەفتەیە. کووانی سووزەنەك رەق و توندە و لەپیاوان لەسەر چووك و لەژنان لەدەرەوەی یان ناوەوەی ئەندامی مێیینەدا پەیدا دەبێ. لەوانەیە لەسەر لێو و مەمك و پەنجە و دەوروپشتی کۆمیش دەربکەوێ. دەتوانرێ میکرۆبی نەخۆشیەکە لەناو ئاوەگوشی برینەکە بە وردبین ببینرێ. ئەو پشکنینانەی خوێنی تایبەتن بە نەخۆشی سووزەنەك بریتین لە پشکنینی (واسەرمان و کان) بەلاّم لەقۆناغی یەکەمدا بەزۆری نێگەتیڤن.

کووانی سووزەنەك بەبێ چارەکردنیش لەماوەی دە یان چل ڕۆژاندا نامێنێ. ئەمەش وا دەکا کە نەخۆش بەهەڵە وابزانێ چاك بۆتەوە. لەوانەشە کووانی سووزەنەك هەر دەرنەکەوێ یان ئەوەندە بچووك بێ کە نەبینرێ.

نەخۆشی سووزەنەك بە دەرمانی پەنسلین بەبڕی باش چارە دەکرێ. هەروەها بە دەرمانی دیکەش وەك تتراسایکلین، بەلاّم دەبێ چارەکردنەکە بەدەستی پزیشك بێ.

قۆناغی دووەم: ئەم قۆناغە دوای نەمانی برینەکە بە دوو یان شەش مانگ دەست پێدەکا و نزیك دوو ساڵان بەردەوام دەبێ. یەکەم نیشانەی سووزەنەك لەقۆناغی دووەمیدا دەرکەوتنی پەڵەی سەر پێستە کە لەسەرتادا لەشوێنێکی لەش دەردەکەوێ و دوایی بەهەموو جەستەدا بڵاودەبێتەوە، تەنانەت لە ناولەپ و بن پێیەکانیش. لەناو دەم و گەروو و دەوروپشتی ئەندامەکانی زاوزێ و کۆم برینی چڵمن پەیدا دەبن. هەر لەنیشانەکانی ئەم قۆناغە

سەرئێشە و تا و هەستکردن بە نەساغی. لەوانەیە مووی لەشی بکەون و ئێسك و جومگەکانی ژان بکەن و چاوەکانی کاریان تێبکرێ و تووشی کەمخوێنیش بێ.

سووزەنەك لەقۆناغی دووەمیدا زۆر درم دەبێ و بەئاسانی دەگوازرێتەوە. هەر بەماچکردن لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەچێ ئەگەر برینی لەناو دەمیدا هەبێ. ئەم قۆناغەش دوای سێ حەفتە یان سێ مانگ بزر دەبێ، بەلاّم لەوانەیە دووبارە پەیدا ببێتەوە. بەو دوو قۆناغەی یەکەم و دووەمی سووزەنەك دەگوترێ سووزەنەکی زوو.

پشکنینەکانی خوێن لەقۆناغی دووەم پۆزەتیڤ دەبن. چارەکردنیشی بە پەنسلین و دژەژیانەکانی دیکە دەبێ. تەنیا پزیشکیش بڕ و ماوەی دەرمان خواردنەکە دیاری دەکا.

قۆناغی سێیەم: ئەمەیان قۆناغی کۆتایی یان شاراوە یان بزرە. لەوانەیە هەر یەکسەر دوای نەمانی قۆناغی دووەم دەربکەوێ یان دوای چەند

ساڵێکی درێژ کە لەنێوان پێنج و پازدە ساڵدایە یان پتریش. لەوانەیە نەخۆشەکە هەستی پێنەکا هەرچەندە میکرۆبەکەی لەناو جەستەدا هەیە و پشکنینی خوێنیشی نێگەتیڤ دەبێ.

ئەم قۆناغە زۆر درم نیە بەڵام زۆر بەترسە بۆ تووشبووەکە خۆی. میکرۆبەکە هێرش دەکاتە سەر گشت خانەکانی لەشی و دەبێتە هۆی کوێربوون و نەخۆشیی بەترس لە سیپەلاکەکان و دڵ و مێشك و هەموو ئەندامەکانی دیکەی ناوەوەی لەش. سووزەنەك تووشی ئێسك و جومگە و پێستیش دەبێ. دوور نیە سووزەنەك برینی زۆر قووڵ لەقاچەکان دروست بکا و ببێتە هۆی سووتانەوەیەکی ڤەکێش لە ئێسکەکانی.

نەخۆشی سووزەنەك لەقۆناغی سێیەم دەبێتە هۆی مردن ئەگەر کاری لە دڵ و کۆئەندامی دەمار کرد. تووشبوونی کۆئەندامی دەمار و مێشك دەبێتە هۆی ئیفلیجی و شێتبوون و دوایش مردن. دەستنیشانکردنی تووشبوونی کۆئەندامی دەمار

بەپشکنینی شلەی ناو مێشك و مووخەپەت دەبێ. یەکێك لەکاریگەریەکانی بۆ سەر دەمارەکان تووشبوونی نەخۆشە بە نارێکی لە رۆیشتن و نەمانی تەرازوو (بالأنس).

چارەکردنی قۆناغی سێیەم پێویستی بەکاتێکی درێژتر هەیە لەوەی لەقۆناغەکانی یەکەم و دووەم هەیەتی. لەوانەیە زۆریش زەحمەت بێ بەتەواوی چارە بکرێ، بەلأم دەرمانی پەنسلین و هیدیکەی لەدژەژیانەکان بوونەتە هۆی چاکبوونەوەی زۆر لەوانەی تووشی سووزەنەکی سێیەم هاتوون.

سووزەنەکی زگماکی: لە دایکەوە بۆ کۆرپەڵەی ناو منداڵدانی لە رێی هاوەڵەوە دەگوازرێتەوە. لەوانەیە ببێتە هۆی لەبارچوونی زگەکەی یان مردنی کۆرپەکەی لەناو زگیدا.

### ٢-١٧. نەخۆشیی دیکەی درم

سووتانەوەی پەردەکانی مێشك Meningitis:

ئەمە سووتانەوەیەکە تووشی ئەو پەردانە دێ کە مێشك و مووخەپەتیان داپۆشیوە. پێشی دەگوترێ

هـــەوكردنی پـــەردەكانی مێــشك و مووخەپـــەت. زۆر جۆرە سووتانەوەی ئەم پەردانە هەیە گرنگترینیـان دووانن. جۆری زۆر باوەكەی بەهۆی میكرۆبی خڕی Meningococcus ئـەم پەردانــەوە پەیـدا دەبــێ و ئـەوی دیكــەیان بــەهۆی میكرۆبــی ســیلەوە دەبــێ. هەروەها جۆری بەكێم و هی ڤایرەسیشی هەیە.

سووتانەوەی پەردەكانی مێشك لەهـەموو كەسێك و لەگـشت تەمەنەكانـدا روو دەدا بـەڵام منـداڵان پـتر ئامادەباشیان هەیە لەگەوران. پتریش لەكەشوهەوای ناوەنجی و گەرمدا دەبینرێ.

سیل، وەرەم، دیق Tuberclosis: نەخۆشیەكی درمە لەنەخۆشێكەوە بۆ یەكێكی ساغ دەگوازرێتـەوە و بەتایبـــەتی تووشـــی ســـیپەلاكەكان دێ، بـــەڵام لەوانەشــە تووشــی هــەر بەشــێكی جەســتە بــێ. میكرۆبی سیل بە چوكڵەی سیل یان باسیلی سیل Tubercule bacillus ناســـراوە. هەرچـــەندە بـەزۆری تووشـی سـیپەلاكەكان دێ بـەڵام لەوانەیـە هێـــرش بكاتـــە ســـەر ئەندامـــەكانی دیكـــەی وەك

گورچیلەکان و گرێیە لیمفیەکان و پێست و گەروو و ئێسك و جومگە و ریخەڵۆك و هەندێك بەشی دیاریکراوی ئەندامەکانی زاوزێ. بەدەگمەن تووشی دڵ و جەرگ و مێشك دێ.

ئەگەر بەمیکرۆبی نەخۆشیەکانی دیکە بەراورد بکرێ، ئەوا میکرۆبی سیل هێواشتر کار دەکا. ئەمەش کاتێکی باش بەپزیشکان دەدا بۆ ئەوەی پێش تەشەنەکردن و لەناوبردنی لەش چارەی بکەن. بەلاَم هێواشی بەرِێوەچوونی نەخۆشیەکە وا دەکا کە ماوەی چارەسەرکردنەکەشی درێژە بکێشێ کە زۆر لەهی دەردەکانی دیکە درێژترە.

زەردەتا Scarlet Fever: نەخۆشیەکی درمە تووشی منداڵان دێ و هۆکارەکەشی میکرۆبێکی شێوە تەزبێحیە کە سووتانەوەی گەروو پەیدا دەکا. هەرکەسێکی بەم میکرۆبە تەزبێحیانە تووشی سووتانەوەی گەروو یان پێست یان گوێی ناوەراست یان هەر شوێنێکی دیکەی بوو، ئەوا تووشی زەردەتاش دێ. بەشێوەیەکی تایبەتی ئەم

دەردە لە زستان و بەهاراندا بڵاودەبێتەوە ئەویش لە ڕێی پڕیشکی دەم و لووتی نەخۆشەوە یان بەهۆی بەکارهێنانی کەلوپەلەکانی وەك جلوبەرگ و قاپوقاچاغ و یاریەکانی. هەندێك جاریش بەشێوەی پەتایەك لە ڕێی شیر و خواردنەوە بڵاو دەبێتەوە.

گەرووخڕە (دەفتیریا) Diphtheria:

نەخۆشیەکە لە نەخۆشیەکانی منداڵان کە زۆر درمە و بەشێوەیەکی گشتی تووشی گەروو و قوڕگ دێ و بەکەمیش لووت دەگرێتەوە. هۆکارەکەی میکرۆبێکی چوکڵەیی تایبەتە و ئەگەر زوو چارە نەکرێ دوور نیە ببێتە هۆی مردن. پێشتر بە ترسناك و کوشندەترین نەخۆشیی منداڵان دەژمێردرا، بەڵام ئەمڕۆ لەزۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هەر نەماوە هەرچەندە لە وڵاتانی دیکە هێشتا هەر ماوە.

نەخۆشی دەفتیریا لە ڕێی ئەو پڕیشکانەوە بڵاودەبێتەوە کە لە دەم و لووت و گەرووەوە دەردەچن. لەوانەیە بە دەستەسڕ و خاولی و

قاپوقاچــاغ و کەلوپــەلی دیکــەی بــەکارهاتووی نەخۆشیش بلاو بێتەوە. هەروەها لەکەسێکیشەوە کە نەخۆش نیە بەلام میکرۆبەکە لەناو گەرووی هەڵدەگریٚ یان بەهۆی کەسێکی کە هێشتا لەقۆناغی چاکبوونەوەدایە دەگوازرێتەوە.

دەردەهــاری Rabies: نەخۆشــیەکی ڤایرەســی مەترســیدارە تووشــی مێشك و کۆئەنــدامی دەمــار دەبــیٚ. ئــەم نەخۆشــیە لــە ئاژەڵــە خــوێن گەرمــە تووشبووەکانی وەك سەگ بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە. ڤایرەســی نەخۆشــیەکە لــەناو لیکــاوی ســەگە تووشــبووەکە دایــە و کاتێــك کــە یــەکێك دەگــریٚ و بریندار ی دەکا دەچێتە لەشیەوە یان لە رێی هەر برینێکی دیکەوە.

ڤایرەسەکە بەناو ریشاڵی دەمارەکانەوە دەگاتە مێشك. تا شوێنی گازگرتنەکە لە سەر نزیکتر بیٚ ئەوەندە گەیشتنی ڤایرەسەکە بۆ مێشك خێراتر دەبیٚ. ماوەی گرتن و دەرکەوتنی نیشانەکانی ئەم دەردە لەنێوان دوو حەفتە و ساڵێکی رەبەق دایە.

بۆیە پێویستە پەلە بکرێ لە کوتانی نەخۆشەکە لەکاتی سەگ گرتنی، بۆ ئەوەی ڤایرەسەکە بکوژێ پێش ئەوەی بگاتە مێشك. هەرکە ڤایرەسەکە گەیشتە مێشك ئەوا دەبێتە هۆی مردن، چ لە مرۆڤ بێ یان ئاژەڵ. پێویستە ئاژەڵەکەش لەلایەن پسپۆڕی خۆیەوە چارە بکرێ.

**خۆپاراستن:** بۆ کەمکردنەوەی تووشبوونی ئاژەڵان و گواستنەوەی نەخۆشیەکە بۆ مرۆڤ پێویستە هەموو ئاژەڵە ماڵیەکان ناوە ناوە لە دژی ئەو دەردە بکوترێن.

**سێبەڕۆ (مەلاریا) Malaria:** مەلاریا نەخۆشیەکی درمی ترسناکە کە بە لەرزهاتنی ناوە ناوە دەناسرێتەوە و لەدوای ئەویش تایەکی بەرز. ئێستا دەرمانی بنبڕی هەیە بەلام لەوانەشە ببێتە ڤەکێش.

**هۆکار:** مشەخۆری مەلاریا زۆر وردە و لەناو خڕۆکە سوورەکانی خوێندا دەژی و بەخوێن گەشە دەکا. مێشوولەی جۆری (ئەنۆفیلس) مشەخۆری

مەلاریا لەنەخۆشەوە بۆ یەکێکی ساغ دەگوازێتەوە کە پێی دەگوترێ (پلازمۆدیەم).

تای گوڵ (کوریکەتا) Rose Fever: ناوێکی کۆنە بۆ سووتانەوەی هەستەوەریی لووت Allergy. ئاو لە لووتی دێ و چاوەکانی دەخورێن و دەپشمێ و پەردەی لینجی ناو لووت دەئاوسێ. لەوانەیە بۆ ناو لوولەکانی هەناسە و سیەکانیشی بچێتە خوارێ.

نەخۆشیەکە وەکو کاردانەوەیەکی هەستەوەریە بۆ جۆرێك لە تۆوی گوڵ کاتێك کە مرۆڤ هەڵیدەمژێ. ئەوەش لە ژمارەیەکی زۆر لە دارودرەخت و رووەکاندا هەیە کە لەژماردن نایەن (نەك تەنیا جۆرێکی گوڵ و گیا). تووشی هەندێك کەسان دێ نەك هەموو کەسێك. ناوی ئەم نەخۆشیە بە هەڵە بەوانە دەگوترێ کە هەندێك مادەی وەك تۆزی ناوماڵ و خوری گیانداران و هەندێك خواردن کار لە جەستە دەکەن و دەبنە هۆی هەستەوەری.

کۆخەڕەشە Whooping cough: نەخۆشیەکی درمە دەبێتە هۆی نۆرە کۆخەی توند کە هەناسە لەنەخۆش دەبڕێ. نەخۆشیەکی بلاوە بەتایبەتی لەناو منداڵانی تەمەن کەمتر لە دە ساڵ، بەتایبەتیش لەپێش پێنج ساڵی.

هۆکاری نەخۆشیەکە میکرۆبێکە لە گەروو لە رێی کۆخە و پشمین و کەلوپەلی بەکارهاتووی نەخۆشەوە بلاودەبێتەوە. ماوەی کڕکەوتنی دەردەکە لە پێنج رۆژ بۆ بیست و یەك رۆژە. بەتێکڕا حەفت رۆژە. ئێستا کوتان لەدژی ئەم نەخۆشیە هەیە کە منداڵان دەپارێزێ.

کەڕووی نینۆکان: بریتیە لەجێگیربوونی کەڕوو لەسەر یەکێك یان پتری نینۆکەکانی دەست و قاچەکان. دەردێکی دەگمەنە و بەشێوەی پەڵەی سپی لەسەر نینۆکەکە دەردەکەوێ. بەزۆری نەخۆشی کەڕووی نینۆکەکان پەیوەندی بە نەخۆشی (پێی وەرزشوانان)ەوە هەیە کە لەهەموو نەخۆشیە کەڕوویییەکان بلاوترە. زۆر بەئاسانی

بلاۆدەبێتەوە. ئەمەش بەهۆی بەکاربردنی خاولی یان لەسەر خاکی تەڕی ژووری گەرماو یان لە ژووری خۆگۆڕیندا تووش دێ.

تاعوون Plague: دەردێکی درمی زۆر توندە کە ئەگەر چارەنەکرێ ڕێژەی مردن تێیدا زۆر بەرزە. لەبنەڕەتدا نەخۆشیەکە هی مشك و گیانلەبەرە قرتێنەرەکانی وەك سمۆرەیە. لە ڕێی کێچ یان دەستدانی ڕاستەوخۆی مشکی تووشبووەوە دەگوازرێتەوە. پێش ئەوەی پەتایەکە لەناو خەڵکدا بلاوبێتەوە لەناو مشکاندا دەبینرێ. بەناوبانگترین جۆری تاعوون ئەوەیە کە بە تاعوونی ئاوسان یان گرێگرێ (دومەڵی) ناودەبرێ. جۆرێکی دیکەی هەیە تووشی سیپەلاکەکان دێ و لەنەخۆشەوە بۆ هیدیکە بە پرپیشکی دەم دەگوازرێتەوە لەکاتی کۆخە و پشمین و قسەکردندا.

تێبینـی: خوێندنـەوەی ئـەو چارەسـەریانەی لـەم ناميلكەيەدا هاتووە جێی پزیشك ناگرێتەوە و تـەنیا پزیـشکە کــە دەستنیـشانکردن و چارەســەریەکان هەڵدەبژێرێ.

